قۆناغی یەکەم و دووەم

زنجیرەی زانیاری ئیسلامی ( ٣ )

مكتبة محوي

# خورەوشت و ئادابەکانی ئیسلام



دانراوی

مامۆستا یحیی سالم الأقطش - مامۆستا فاروق عبدالحلیم بدران

دکتۆر جمعه عوض الخباص



وەرگێرانی بۆ کوردی

انور قادر شێخانی

چاپی یەکەم - هەولێر

2015ز 1436ك

زنجیرەی زانیاری ئیسلامی
(٣) و (٤)

# خوڕەوشت و ئادابەکانی ئیسلام

قۆناغی (یەکەم و دووەم)

قۆناغی یەکەم

دانراوی
مامۆستا یحیى الاقطش    مامۆستا فاروق بدران
دکتۆر جمعه الخباص
وەرگێڕانی
انور قادر شێخانی

هەولێر
چاپی یەکەم
١٤٣٦ك - ٢٠١٥ز

ناوی كتێب: خورەوشت و ئادابەكانی ئیسلام قۆناغی یەكەم و قۆناغی دووەم

لیژنەی سەرپەرشتیكردن بۆ دانانی ئەم پەرتوكە:

مامۆستا دكتۆر اسحاق الفرحان سەرۆك لیژنە

دكتۆر عبدالله الخباص ئەندام

دكتۆر مامۆستاعلی الصوا ئەندام

دكتۆر كاید قرعوش ئەندام

مامۆستا محمود ابو سمور ئەندام

دكتۆر زید ابو الحاج ڕێكخەری گشتی

گۆرینی بۆ كوردی: انور قادر شێخانی

تایپ و دیزاین: نووسینگەی هیوا - یونس عباس إسماعیل

هەولێر : ٢٠١٥ - ١٤٣٦

چاپی یەكەم: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتی یەكان ژمارەی سپاردنی (٥٢)ی ساڵی (٢٠١٥)ی پێدراوە.

مؤسسة التأليف

جمعية الدراسات والبحوث الاسلامية

عمان – الاردن

# پێشەکی دەقە عەرەبیەکە

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على رسوله الامين محمد(ﷺ) وبعد:

خۆم بە بەختەوەر دەزانم کە ئەم کتێبە پێش کەش بکەم بە نەوەکانی قوتابیم وە ناوەرۆکەکەی هەندێك خورەوشتو ئادابی ئیسلامی لەخۆ دەگرێت وە ئادابی ئیسلامی ئەو رەوشتەیە کە موسڵمان پێیەوە جیادەکرێتەوە لەخەڵکانی تر چونکە لەبەر ئەوەی بیروباوەڕی ئیسلامی هەڵقوڵاوە وە لەقورئان و فەرمودەی پێغەمبەرا سەرچاوەی گرتووە.

وە ئادابە ئیسلامیەکان خورەوشتی ئیسلامی یە کە بۆ چوار دەوری جیهان بڵاوبۆتەوە وە خەڵکانی جگە لەموسڵمان کە دەبینن خورەوشتی موسڵمانان و ئاینی ئیسلام سەریان سووڕدەمێنێ دێنە ناو ئیسلام وەدەبنە پێشڕەوی ئیسلام، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾القلم.

واتە: بەراستی تۆ لەسەر خۆڕەوشتی بەرزی.

وە بەم خورەوشتە بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوە نمونەی رەوشت جوانیو پێشەنگی کاروانی ئیسلامەتیو بەهۆیەوە خەڵك پەیتا پەیتا دەهاتنە نێو ریزی ئیسلام.

وە ئەم پەرتوکە بچوکە بریتی یە لە(٣٠) وانە لەئادابەکانی ئیسلام ، دەست پێ دەکات بە ئادابەکانی سڵاو کردنو کۆتایی هات بە ئادابی رێزگرتن لەزانایان و ئادابی قورئان خوێندنو هتد...) وە بریتی یە لەئادابی هەڵسو کەوت لەگەڵ قورئان و لەگەڵ خەڵکان وەکو ئازایەتی و راستگۆییو ئیخلاصو چاوپۆشیو لێبوردەیی و مل کەچیو ئارامیو بەبەزەیی و نەرمو نیانی وە هەروەها گوێڕایەڵی دایكو باوك وچاکە کردن لەگەڵیان.

وەلەخوا داواکارین گەنجەکانمان هیدایەت بدات بۆ سەر ئیسلام و پەیڕەو کردنی ئادابی ئیسلام

دانەران



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

## پێشەکی وەرگێڕ

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى اله وصحبة ومن تبعه باحسان الى يوم الدين.
ئـەم پەرتوکـەی بەردەسـتان بـریتی یـە لەچـەند ئادابێـك و خوڕەوشـتێك کـە پێویسـتە بابـای موسڵمان پەیڕەوی بکات و پابەند بێت بۆ سەربەرزی دونیاو قیامەت وە پێی یـەوە بپەڕێتـەوە بۆ نازو نیعمەتەکانی خوا لەبەهەشتدا وە ئەو بابەتانەش (٣٠) وانە لـەخۆ دەگرێت کـە ئـادابی قورئـان خوێنـدنو سـڵاو لێـك کـردنو پـاكو خـاوێنی لـەشو ئـادابی خـواردنو خواردنـەوە و چەندەها ئادابی تر دەست پێ دەکات .
وەلەخوای گەورە داواکارم کە ئەم پەرتووکە ببێتە مایەی خۆش بەختی بۆ ئەوانـەی پـەیڕەوی دەکەنو خوای گەورەش لێمان وەربگرێت ودوورم بکات لـەریاو ریابـازانو شـەرمەزاری بـازاری قیامەت نەبین وەئەگەر لەم نوسینەم دا پێکابم ئەوە لەفەزڵو گەورەیی خوایە و مـن هـیچ نـیم وە ئەگەر هەڵەشم کردبێ ئەوە بەسـەر خـۆم دابدەنـەوەو لەنـەزانیو کـەمو کـوڕی خۆمەوەیـە تەنها چاوەڕوانی دوعای ئێوەم کە خوا ئێوەو من لەبازاڕی قیامەت سـەر شـۆڕنەکات وە لـەژێر ئاڵای ئیسلام حەشرمان بکات امین والحمد لله رب العالمين.

انور قادر شێخانی
٢١ شوال ١٤٣٤ك بەرامبەر ٢٠١٣/٨/٢٨.
هەولێر – گەڕەکی گوڵان



## پێش کەشە بە:

- گیانی پاکی پێشەوای مرۆڤایەتی موحەممەدی موستەفا (ﷺ).
- هەموو هاوەڵانو شوێن کەوتوانو زانایان و ئەولیاو خزمەت گوزارانی قورئان و دینی خوا.
- بە دایك و باوکم و خێزانەکەم کە یارمەتی دەرم بون بۆ شەیدابوونم بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام.
- بەهەموو برادەران و مامۆستایانی کە یارمەتیان دامو وە بە تایبەتی خاوەنی کتێبخانەی مەحوی لەهەولێر کە بە پەرۆشەوە یارمەتی دام بۆ وەرگێڕانی هەموو ئەو پەرتوکانەی کە وەرم گێڕان.
- وە بە هەموو مرۆڤ دۆستان کە بەراستی شوێنو رێبازی بەختەوەری دا دەگەڕێن تا دەستیان کەوێ لەسزای گۆڕو بازاڕی قیامەت رزگاریان بێت.

## وانەی یەکەم

### قورئان داوای خوورەوشت جوانی دەکات



خوای گەورە وەسفی پێغەمبەرەکەی موحەممەد (ﷺ) دەکات لەئایەتێ لەقورئانی پیرۆز کە دەفەرموەێ ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾﴾القلم. بەراستی تۆ لەسەر رەوشتو خویەکی زۆر جوان و پەسەندو بێ وێنەو مەزنیت). تەفسیری ئاسان ل:٥٦٤. وەلەو کاتەی پرسیار لەعائیشە خان (رضي الله عنها) کرا دەربارەی خوورەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (كانَ خُلُقُهُ القرآن). وە موسڵمان لەقورئانەوە فێری خوو رەوشتی جوان دەبێت وەلەخورەوشتی ئیسلامە کە قورئان هێناى ئەویش قەدەغەکردنی جاسوسیو دووروویی یە کە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم ﴿١٢﴾﴾الحجرات. واتە: بەشوێن عەیبو عارو کەم و کوڕی یەکتردا مەگەڕێنو سیخوری مەکەنو پاش ملە باسی یەکترو ناوی یەکتر بەخراپە مەبەن)تەفسیری ئاسان: ل:٥١٧. دروست نی یە بۆ موسڵمان کە بە شوێن عەیب و عاری دراوسێ یەکەی یان برادەرەکەی دا بگەڕێ. وەلەخورەوشتی موسڵمانە بە لوتفو بەزەیی بێت و نەرمو نیان بێت لەگەڵ خەڵکیدا هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ ﴿١٥٩﴾﴾آل عمران. واتە: ئەگەر توڕەو قسە رەقو بێ بەزەیی بویتایە ئەوە هەموو لەدەورت بڵاوەیان دەکرد)تەفسیری ئاسان:ل٧١. وەلەخورەوشتی موسڵمانە یەکسانیو دادپەروەری لەنێوان خەڵکیدا وە چاکەکردن لەگەڵیاندا وە هاموشۆی خزمانی نزیك، خوای گەورە دەفەرموێ ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ ﴿٩٠﴾﴾النحل. واتە: بەراستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەریو چاکەکاریو یارمەتی دان و بەخشندەیی بە خزمان وەقەدەغەکردنی لەگوناه و تاوان و دەست درێژی دەکات) تەفسیری ئاسان:ل:٢٧٧. خورەوشتی بەرزو بەڕێز ئەوەیە کە پەیرەو بکرێت لەنێوان خەڵکی وە بە هۆی ئەوەوە خۆشەویستی بەرپادەبێت لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگادا.

**من منداڵی موسڵمانم پەیڕەوی خورەوشتی ئیسلام دەبم**

## هەڵسەنگاندن

١ وەڵام بدەوە بە ووشەی بەڵی یان نەخێر لەبەرامبەر ئەم دەستەواژانەی خوارەوە:

لەو کاتەی پرسیار لەعائیشە خان (رضي الله عنها) خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) کرا دەربارەی خورەوشتی پێغەمبەر (ﷺ)، لەوەلامدا فەرموی:

- خورەوشتی قورئانە ( ✓ )
- جلو بەرگی خاوێن لەبەر دەکات ( ✓ )
- حەزی لەپرچی سەریەتی ( ✗ )

٢ ستونی لای راست بگەیەنە بە ستونی لای چەپ کە لەگەڵ یەك دا بگونجێن:

| | |
|---|---|
| لەخورەوشتی موسڵمانان | لەدەست درێژی |
| بە خورەوشت | دادپەروەی |
| خوا نەهی کردووە | بەردەوام خۆشەویستی لەنێوان خەڵکی دەبێت |

لەبەرامبەر دەستەواژەی ئەمانەی خوارەوە بنوسە (رازیم یان نارازیم)

٣ هەڵوێستی راستی موسڵمانان ئەوەیە کەوا:

- جاسوسی ناکات ( ✓ )
- پاش ملە باسی خەڵك دەکات ( ✗ )
- خاوەن خورەوشتی جوانە ( ✓ )

٤ ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز رەنگ بکە:

وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ



## وانەی دووەم

# ئادابەکانی سڵاوکردن



مامۆستا وتی:کە دەچینە شوێنێك کە کۆمەڵێ خەڵکی لێ بێت ئێمە سڵاویان لێ دەکەین و دەڵێین (السلام علیکم ورحمە الله وبرکاتە) ئەوانیش لەوەڵامدا دەفەرمون (وعلیکم السلام ورحمە الله وبرکاتە).

عەلی: سڵاوێکی جوانە، وامان لێ دەکات خەڵکمان خۆش بوێت

مەئمون: ئینجا با هەمو کەسێك سڵاو بکات کە دەگات بە کەسێکی تر چونکە سەلام سڵاوی ئیسلامەتی یە.

مامۆستا:خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ﴾النساء. واتە: هەرکاتێ سڵاوو چاکو چۆنیەکتان لەگەڵ کرا ئەوە بە جوانتر لەسڵاوەکەی تر یاخود(هیچ نەبێت) وەکو خۆی وەڵامی بدەنەوە.

پێغەمبەری خوا دەفەرموێ (ﷺ) ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر بکەن لەلای یەکتر خۆشەویست دەبن کە ئەویش ئەوەیە کە سڵاو لەنێوانتان بەرپا بکەن) موسلیم ریوایەتی کردووە. وەلەبەر ئەوە سوار سڵاو لەپیادە دەکات وە بچوك لەگەوران وە ئەوەی دادەبەزی سڵاو لەئەوەی دانیشتووە وە تاك لەکۆمەڵ سڵاو بکات.

**من منالی موسڵمانم سڵاو لەهەمو کەسێك دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

**١ نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر رستەی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر رستەی چەوت دابنێ.**

سەلام سڵاوی ئیسلامەتی یە وەئێمەش سڵاو دەکەین لەم کاتانەی خوارەوە:

- لەکاتی نوستن
- لەکاتی گەیشتن بە خەڵك
- لەکاتی خواردندا.
- لەکاتی ئاو خواردنەوەدا

**٢ رستەی لای راست بگەیەنە بە رستەی لای چەپ بە ووشەی گونجاو**

| | |
|---|---|
| سوار سڵاو لە | کۆمەڵ دەکات |
| بچوکان سڵاو لە | لە سەرکەوتوان دەکات |
| دابەزان سڵاو لە | رۆیشتوو دەکات |
| تاك سڵاو | لە گەوران دەکات |

**٣ ئەم ئایەتەی خوارەوە لەبەر بکە:**

﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ ﴾ النساء.

**٤ ئەم دەستەواژەیە رەنگ بکە:**

سەلام سڵاوی ئیسلامەتی یە

هەر کاتێ گەیشتم بە کەسێ بیناسم یان نەی ناسم سڵاوی لێ دەکەم

## وانەی سێ یەم

# ئادابەکانی قورئان خوێندن (١)



مامۆستا هاتە ژوورەوەی پۆلەکە و قورئانێکی بەدەستەوەبوو، پاش سڵاو کردن ووتی بە قوتابیەکان: وانەی ئەمرۆمان سورەتی فاتیحەیە من بۆتان دەخوێنم وە ئایەت بە ئایەت ئێوەش لەدوای من دووبارەی دەکەنەوە.

ئوسامە: پێش دەستپێکردنی خوێندنەوەی قورئان چی دەڵێین ئەی مامۆستا؟

مامۆستا: پەنا دەگرین بە خوا لەشەیتانی دورخراو، لەپاشان دەست دەکەین بە قورئان خوێندن. خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْءَانَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾النحل.

واتە:کە قورئانت خوێند پەنا بگرە بە خوای مەزن لەشەیتانی دورخراو لەرەحمەتی خودا.

زەید: ئایا مەرجی هەیە کە دەبێ بە دەست نوێژەوە قورئان بخوێنین.

مامۆستا: جوانەو زۆر باشە پێش دەست کردن بە قورئان خوێندن دەبێ دەست نوێژ بگرین.

جەعفەر: وە ئایا دەبێ بەدەنگی بەرز قورئان بخوێنین؟

مامۆستا: بەدەنگێکی واکە نوستوو هەڵنەستێنێ‌و نوێژکەریش نوێژی لێ تێك نەچێ.

خالید :من بۆتان دەخوێنم کە خوا دەفەرموێ ﴿ فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْءَانِ ﴿٢٠﴾ ﴾المزمل. واتە: ئەوەندەی بۆت دەکرێ قورئان بخوێنە.

مامۆستا: باشت کرد، با هەمومان وەکو خالیدبکەین.

**من منالی موسڵمانم قورئان دەخوێنم بە دەنگی نزم**

## هەڵسەنگاندن

**١** نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر دەستەواژەی راست و نیشانەی (✗) بەرامبەر دەستەواژەی چەوت دابنێ لەمانەی خوارەوە:

یەکەم شتێ کە بیکەین پێش قورئان خوێندن:

- پەنا دەگرین بە خوا لەشەیتانی دورخراو.
- ناوی خوا دێنین و دەڵێین (بسم الله الرحمن الرحیم).
- یەکسەر دەست بە خوێندن دەکەین.

**٢** ئەم وشانەی خوارەوە لەشوێنی گونجاو دابنێ لەم رستانەی خوارەوە:

نووستوو | گوێ لێ گراو | نوێژکەر

قورئان دەخوێنین بە دەنگی .......... کە هەڵنەستێنێ پیاوی .......... و ..............هەراسان نەکەین.

**٣** ستونی لای راست بگەینە بە ستوونی لای چەپ.

| | |
|---|---|
| خوێندنەوەی قورئان | چەندە دەتوانیو بۆمان گونجاوە قورئان بخوێنین هەموو رۆژێ |
| لەجوانی خوێندنە | خوێندنی قورئان بە دەنگی گوێ لێ بوو |
| باشترە | دەبێ دەست نوێژ بگرین پێش خوێندن |

**٤** ئەم ئایەتە پیرۆزە لەبەر بکە:

﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾



## وانەی چوارەم

## ئادابی قورئان خوێندن (٢)



لەپاش تەواو بونی وانەی قوتابخانە قوتابیان گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، وە زەید بەرەو ژووری خۆی ڕۆیشت تاکو ئەوەندەی ئەتوانێ قورئان بخوێنێ وە هەڵسا بەم کارانەی خوارەوە:

- بەرەو دۆلابەکەی کە قورئانی پیرۆزی تیایە ڕۆیشت.
- قورئانی پیرۆزی دەرهێنا و بەرامبەر رووگە (قیبلە) دانیشت.
- قورئانەکەی کردەوە و تەماشای پێڕستی سوڕەتەکانی کرد .
- دەستی کرد بە تەمەشاکردنی سەرجەم ناوی سوورەتەکان کە ژمارەیان سەدو چواردە سوڕەتە.
- دەستی کرد بە خوێندی چەند سوڕەتێك بە ووردی و بیرکردنەوەی و هەوڵی دا لەماناکەی بگات. سوڕەتی (الناس)ی خوێند لەپاشان سوڕەتی (الفلق)لەپاشان سوڕەتی (الاخلاص) وە ئەم سێ سوڕەتەی لەبەر کرد.

زەید لەناخی خۆیدا ووتی هەمو ڕۆژێ چەندی پێم بکرێ سوڕەتەکانی کورتی قورئان دەخوێنم وە هەوڵی تێگەیشتنی ماناکانی دەدەم ولەبەریان دەکەم. وەقورئانەکەی لەشوێنی بەرزی خۆی دانایەوەو تاکو دوورە دەست بێ لەدەستی منالان و براکانی و خوشکە بچوکەکانی.

**من منالی موسڵمانم هەموو ڕۆژێ بە قەد توانام چەند سوڕەتێ لەقورئانی پیرۆز دەخوێنم**

## هەڵسەنگاندن

**١** وشەی (بەڵێ) لەبەرامبەر رستەی راستو ووشەی (نەخێر) لەبەرامبەر رستەی چەوت دابنێ.

لەئادابی خوێندنەوەی قورئان:

- دەبێ دەست نوێژمان هەبێ.
- قورئان بخوێنین بە دەنگێ کە هەموو خەڵك گوێ بیستی بن.
- قورئان دەخوێنم بە خوێندنەوەی بێ دەنگی.

**٢** ئەم سێ سورەتانە ریز بکە لەدواین بەشی قورئانی پیرۆز.

| | |
|---|---|
| سورەتی کۆتایی | الاخلاص |
| سورەتی پێش کۆتایی | سورەتی الناس |
| سورەتی ژمارە ١١٢ | سورەتی الفلق |

**٣** ئەم دو وشەیە بخە شوێنی گونجاو:

قیبلە     قورئانی

لەو کاتەی................ دەخوێنین باشترە کە رووومان لە...................بێت.

ئەم چەند وشەیە رەنگ بکە:

زەید پێش قورئان خوێندن دەست نوێژی شوشت



## وانەی پێنجەم

# خاوێنی جل و بەرگ و لاشە



لەژوری پۆلەکە مامۆستا پرسیاری لەقوتابیەکان کرد ووتی چۆن زاڵ بین بەسەر خاوێنی و پاکژی خەڵکی؟ لەپاشان مامۆستا دوو خولەك کاتی پێ دان بۆ ئەوەی وەڵامی بدەنەوە، لەپاشان ووتی (خوای گەورە پاك و خاوێنی خۆش دەوێ لەهەموو شتێکا، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی (تنظفوا فإن الاسلام نظيف ) رواه ابن حبان. وە ئەمەش پاكو خاوێنی لاشەیە.

مەحمود: ئەی دەربارەی پاكو خاوێنی نینۆکەکان؟

مامۆستا: لەدەستەواژەی ئیسلام هەیە چەند زاراوەیەك کە پێی دەوترێت (سنن الفطرة) سونەتەکانی فیترەت کە ئەوانیش پەیوەندی بە پاكو خاوێنی لاشە هەیە لەوانە (نینۆك کردن وددان شوشتن و خۆشوشتن لەرۆژی هەیینی کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوین لەکاتی چونمان بۆ مزگەوت خۆمان پاك رابگرین هەروەکو دەفەرموێ: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ﴿٣١﴾﴾ الأعراف. واتە: ئەی نەوەی ئادەم خۆتان برازێننەوە بە پۆشاك لەبەرکردن لەکاتی هەمو نوێژو چوونە ناو مزگەوت )تەفسیری ئاسان:ل١٥٧.

موراد: بەڵێ پاكو خاوێنی واتە خۆ رازاندنەوە.

مامۆستا: پاكو خاوێنی دەت گەیەنێتە زینەتو جوانی.

پێغەمبەری خوا دەفەرموێ (ﷺ): (إن الله جميل يحب الجمال ).

واتە: خوای گەورە جوانەو جوانی خۆش دەوێ.

**من منداڵی موسڵمانم خاوێنو پاکژم وە پاكو خاوێنم خۆش دەوێ**

## هەڵسەنگاندن

**١** نیشـانەی ( ✓ ) بەرامبـەر دەسـتەواژەی راسـت دابـنێو نیشـانەی ( ✗ ) بەرامبـەر دەستەواژەی هەڵە دابنێ.

لەنیشانەکانی خاوێنی کە موسڵمان پێ یەوە جیادەکرێتەوە:

- نینۆك کردن
- خۆشوشتن مانگێ جارێك
- ددان شوشتن

**٢** هەر رستەیەك لەستونی لای راست بگەیەنە بە رستەی گونجاوی ستونی چەپ:

| | |
|---|---|
| خوا جوانە | خاوێنی لاشە |
| خاوێنی دەبێتە هۆی | جوانی خۆش دەوێ |
| سونەتەکانی فیترەت | زینەت و جوانی |

**٣** ئەم وشە ناتەواوانەی خوارەوە تەواو بکە:

چەند شێوەیەك لەخاوێنی بۆ نموونە:

- خاوێنی ددان
- خاوێنی ..................
- خاوێنی ..................
- خاوێنی ..................

## وانەی شەشەم

# خاوێنی شوێن




ئیمان داوای مۆڵەتی لەمامۆستا کردو ووتی مامۆستا ئایا دەتوانی باسی پاکو خاوێنی شوێنمان بۆ بکەی لەئیسلام دا.

مامۆستا: ماڵی خاوێن ئەوەیە دەبێ گۆرەپانو، حەوشەو، ژوورەکانی خاوێن بن و کەلو پەلو شتی تێدا خاوێن بێت.

ئیمان: ئەی دەربارەی دەرەوەی ماڵەوە ئەی مامۆستا گیان.

مامۆستاکەی ووتی: شەقامەکان دەبێ پاکو خاوێن بن چونکە خاوەن ماڵ دەبێ شتی پیس بخاتە ناو تەنەکەی خۆڵو شوێنی گونجاو.

پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرموێ: (النّظافَةَ تدْعُو الى الايمانِ والايمانُ مَعَ صَاحِبِه في الجنة) رواه الطبراني. واتە: خاوێنی بانگەوازی ئیمان دەکات، ئیمان و برواش خاوەنەکەی دەبات بۆ بەهەشت.

ئیمان: ئایا دروستە درِکو داڵو شتی خراپو پیسو پارچە دەستەسرِی بەکارهێنراو بخەینە سەرشەقامەکان.

مامۆستا: نەخێر نابێت ئەی ئیمان چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (اعطوا الطريق حقه، قلنا وما حق الطريق؟ قال: غض البصر ورد السلام وإماطة الأذى عن الطريق) رواه مسلم. واتە: دەبێ مافی رێگاو بان بدەن، ووتمان مافی رێگاوبان چییە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموی: (چاونوقاندن لەبەر شتی نامەحرەمو وەڵام دانەوەی سڵاوو، لابردنی شت لەسەر رێگا کە ئازاری خەڵک بدات).

**من منداڵی موسڵمانم پارێزگاری لەخاوێنی جێگاو رێگا دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

### ١ ئەم دەستەواژانە تەواو بکە:

شتێ کە ئازاری هەبێت لەسەر ڕێگا لادەبەین وەکو:

- دار
- پاشماوەی شیرنەمەنیو دەستەسڕ
- ......................
- ......................

### ٢ ئەم دەستەواژانە تەواو بکە:

ئێمە ئومەتی ئیسلامین دەبێ هەر شوێنو جێگایەك خاوێن بێت وەکو :

- پشت خانوو
- گۆرەپانی قوتابخانە.
- ..............................
- ..............................
- ..............................

### ٣ ئەم فەرمودەیە لەبەر بکە:

پێغەمبەری خوا دەفەرموێ:

اعطُوا الطَّريقَ حَقهُ . قُلْنَا ومَاَ حَقَ الطّريقِ؟ قالَ:

(غَضُ البَّصرِ ورد السلامِ وإماطَةُ الأذى عَنِ الطَريقِ ).

## وانەی حەوتەم

# لەئادابەكانی چونە مزگەوت



سێ منالەكە لەگەڵ باوكیان بە هێمنی بەرەو مزگەوت كەوتنە ڕێ وە هەمویان لەپێش دا دەست نوێژیان گرتبوو وە هەمویان جلی خاوێنیان لەبەر كردبوو.

باوك: ئەی منالەكانم تەماشای مزگەوت بكەن ئەوە جێگای خواپەرستی یە بەردەوام كراوەیە بۆ هەر كەسێك بچێتو بیەوێت بۆ خواپەرستی لەموسڵمانان، وە ئەوە شوێنێكی پاكو خاوێنە وە نابێت پیسی تێ بكەوێ، وە دەبێ پێڵاوەكانمان داكەنین لەپێش چوونە ناو مزگەوت وە بیخەینە سەر ڕەفەكەی كە بۆی ئامادەكراوە تاكو هەردەم مزگەوت پاكو خاوێن بێت.

باوك: بابەهێمنی بچینە ژورەوەو دەنگ بەرز نەكەینەوە وە خۆمان بەشتێ جگە لەنوێژ سەرقاڵ نەكەین وە نابێت موسڵمانان بە دەنگی بەرز هەراسان بكەین وە ئەوەش كەبیر نەكەی كە دەبێ بە قاچی ڕاستەو دوعاكردن بچینە ناو مزگەوت.

یەك لەكوڕەكان: وە چی بكەین ئێستا؟

باوك: هەر یەك لەئێمە با دوو ڕەكات سونەتی سڵاوی مزگەوت بكات (تحيه المسجد) وە نابێت بەسەر ملی خەڵكان دا تێپەڕین وە نەمزاحەمەو قەرەباڵغی پەیدا بكەین. لەپاشان تاقامەتی نوێژ دەكرێ چەندی پێمان بكرێ قورئان دەخوێنین.

یەك لەكوڕەكان: ئەی باوكە تۆ ئادابو چاودێری چوونە ناو مزگەوتت فێركردین وەلەئایندەدا بەو ئەدەبەی كە خودا حەزبكات دەچینە نێو مزگەوت.

**من منالی موسڵمانم بە هێمنی دەچم بۆ مزگەوت وە پارێزگاری لە پاكو خاوێنی دەكەم**

## هەڵسەنگاندن

١ ووشەی (ڕازیم ) یان (ناڕازیم) بنوسە لەشوێنی گونجاو:

لەوکاتەی دەچمە مزگەوت بە پێ، من:

- دەڕۆم بە هێمنی
- بەغاردان دەچم تاکو بگەمە نوێژەکان.
- دەگەڕێمەوە بۆماڵەوە پێش نوێژ بە کاتێکی دیاری کراو.

٢ نیشانەی (✓) بەرامبەر ڕاستەی ڕاستو نیشانەی (✗) بەرامبەر ڕستەی چەوت دابنێ.

لەوکاتە دەچینە ناو مزگەوت لەسەرمان پێویستە:

- جلی خاوێن لەبەر بکەین.
- بە غاردان بچین بۆ ڕیزی یەکەم
- بە قاچی ڕاست بچینە ژوورەوە.

٣ دەستەواژەی ستونی ڕاست بگەینە بە دەستەواژەی گونجاوی ستونی چەپ.

| | |
|---|---|
| کە چوینە مزگەوت | بە دەنگی نزم |
| گفتو گۆ دەکەین لەناو مزگەوت | بۆ ئەوەی مزگەوت بەردەوام پاکو خاوێن بێ |
| لەکاتی چوونە ژوورەوە پێلاوەکانم دادەکەم | نوێژی سڵاوی مزگەوت دەکەین |

## وانەی هەشتەم

### سڵاوی مزگەوت ( تحية المسجد )



حەسەن لەگەڵ باوکی چوونە مزگەوت بۆ بەجێ گەیاندنی نوێژ وە حەسەن دانیشت بەڵام باوکی دەستی بە نوێژکردو لەوکاتەی کە لەنوێژبویەوە حەسەن لەباوکی پرسی ئەوە چ نوێژێك بو ئەنجامت دا ئەی باوکی خۆم پێش نوێژی فەرز؟

باوك: ئەوە چەند ئادابێکە بۆ مزگەوت کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إذَا دَخَلَ أحَدُكُم المَسجدَ فَلْيصَلِّ ركعتين قَبْل أنْ يَجلس) رواه مسلم. واتە: ئەگەر کەسێك چوە مزگەوت باپێش دانیشتن دوو رەکعات نوێژی سڵاوی مزگەوت بکات.

حەسەن: مادام وایە منیش هەڵدەستم دو رکعات نوێژی سونەت دەکەم، حەسەن هەڵساو دوو رەکعات نوێژی کردو لەتەنیشت باوکی دانیشت بە مل کەچییەوە.

باوك: ئەگەر موسڵمانێ چوە ناو مزگەوت بە مل کەچیو بە دەست نوێژەوە هەروەکو ئێمە ئەنجاممان دا سوننەتە بۆی نوێژی سوننەت بکات وبۆ نزیك بوونەوە لەخوا وە ئەم دوورەکعاتەش موسڵمان بە تەنیا دەی کات پێی دەڵێن (تحیە المسجد) سڵاوی مزگەوت.

حەسەن: ئایا هەموو مزگەوت ئەم سوننەتەی تیادا دەکرێ ئەی باوکی خۆم.

باوك: بەڵێ هەموو مزگەوتەکان ئەی کوڕی خۆم تەنیا مزگەوتی حەرام کە لەمەککەی پیرۆزە ئەویش سوننەتی (تحیە المسجد)ی تەواف کردنە بە دەوری کەعبەدا حەوت جاران.

**من منالی موسڵمانم سوننەتی سڵاوی مزگەوت ئە نجام دەدەم**

## هەڵسەنگاندن

**١ نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر وەڵامی راستو نیشانەی ( ✗ )بەرامبەر دەستەواژەی چەوت دابنێ.**

موسڵمان نوێژی (تحیە المسجد) دەکات

- چوار رەکعات
- دو رەکعەت
- سێ رەکعەت

**٢ ووشەی بەڵێ یان نەخێر لەبەرامبەر رستەی خوارەوە دابنێ**

ئەگەر چووینە مزگەوتی حەرام لەمەککەی پیرۆز ئەوا سونەتی (تحیە المسجد):

- دوو رەکعەتەو بەس.
- تەواف کردنە بە دەوری کەعبە حەوت جار.
- چوار رەکعاتە.

**٣ ووشەی گونجاو لەشوێنی راست دابنێ لەمانەی خوارەوە:**

الفاتحە | کورت | دوورەکعەت

لەوکاتەی دەچیتە مزگەوت لەسەرتە نوێژی ............سوننەتی (تحیە المسجد) بکەی لەهەر رەکعەتا سورەتی ....................بخوێنەو لەدوای ئەویش سورەتێکی ...............بخوێنە.

## وانەی نۆیەم

# ئادابەکانی دوعا



پاش کۆتایی هاتنی نوێژ، پێش نوێژخوێن (الامام) دەستی بەرزکردەوەو دەستی بە نزاو پاڕانەوە کرد کە خوای گەورە سەرکەوتن بەشی موسڵمانان بێت وەلەگوناهو تاوانیان خۆش بێت ورۆزی حەلالیان بە نسیب بکات.

ئیمامی نوێژ: نزاو پاڕانەوە ئەوەیە کە موسڵمان داوا لەخوا بکات هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾البقرة. واتە: ئەی موحەممەد ئەگەر بەندەکانم پرسیارت لێبکەن دەربارەم، ئەوا من نزیکم لێیانەوە، وەبە هاناو هاواری دوعا گۆیانەوە دەچم هەر کاتێك لێم بپاڕێنەوە نزا بکەن، دەبا ئەوانیش بە دەم بانگەوازی منەوەبێنو باوەڕی دامەزراو بە من بهێنن بۆ ئەوەی ڕێگای هۆشیاری وئاگایی بگرنە بەر بۆ بەدەست هێنانی سەربەرزیو سەرفرازی هەردوو دونیا )تەفسیری ئاسان: ل:٢٨.

وە ئادابەکانی دوعا:

- مل کەچی لەکاتی دوعاکردن دا.
- هەڵبژاردنی شوێنو کاتی گیرابونی دوعا بۆ نمونە پاش نوێژەکانو لەکاتی کڕنۆش دا.
- پێداگری لەدوعا کردن خوا دەفەرموێ:﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴿٦٠﴾ ﴾غافر. واتە: نزام لێ بکەن وەڵامتان دەدەمەوە).
- دوعای چاك کردن بۆ خۆتو خەلکانی تر.
- دورکەوتنەوە لەدوعای خراپ کردنو زیان گەیاندن بە خەڵکانی تر
- بێ ئومێد نەبون لەگیرابوونی دوعا چونکە خوا بە بەزەییو بە ڕەحمەو وەڵامی دوعا گۆیان دەداتەوە.
- دوعا لەخۆشیو ناخۆشی.

**من منالی موسڵمانم دوعای خێر بۆ خۆمو خەڵکانی تر دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

**١ ئەم رستە ناتەواوە تەواو بکە:**

ئادەمیزاد دوعا دەکات بەوەی حەزی لێ یەتی وە لەوانە:

- کە خوا رزق و رۆزی حەلالی بداتێ
- ........................
- ........................

**٢ ووشەی (بەڵێ) یان (نەخێر) بەرامبەر بە دەستەواژەی خوارەوە دابنێ**

ئێمە دوعا دەکەین کە خواش خاوەنی وەڵام دانەوەیە وەلەبەر ئەوەیە لێی دەپاڕێنەوە:

- پاش نوێژەکان
- ساڵێ جارێك
- لەکاتی ناخۆش و بەس.

**٣ ئەم ئایەتە پیرۆزە لەبەر بکە:**

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ (١٨٦) ﴾

**من منداڵی موسڵمانم هاواری خوا دەکەم و هەر کاتێ کارەکم لێ وە زەحمەت هات**

## وانەی دەیەم

# ئادابەکانی خواردن



خانەوادەکە لەسەر خوانی نان خواردن دانیشتن وە لەپێش هەریەکێکیان قاپێك خواردنی تایبەتی دانرابوو وە لەگەل کەوچکێك.

باوك:با لەپێشدا ناوی خوا بهێنین ، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ووتی بەمناڵێك (ئەی منالّ ناوی خوا بهێنەو بە دەستی راستو ئەوەی لەپێشەوەی خۆت دایە بیخۆ).

ئەسعەد: مانای چی یە (مما يَلِيكَ) واتە لەپێشەوەت دایە؟

باوك: مانای ئەوەیە ئەو شتە بخۆ کە لە تۆ نزیکەو لەپێشەوەت دایە نەك ئەوەی لەپێش هاوەڵەکانت دایە وە هەر ئەم ئادابەش بەس نییە بەڵکو چەند ئادابی تر هەیە بۆ خواردن بۆتان باس دەکەم.

- نابێت زیادەڕەوی بکرێت لەخواردن چونکە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشۡرَبُوا۟ وَلَا تُسۡرِفُوٓا۟ ۝٣١ ﴾ الأعراف. واتە: بخۆنو بخۆنەوە و زیادەڕەوی مەکەن).
- خواردنی زۆر گەرم ناخۆین.
- ئەوەندە دەخۆین کە بەری دڵمان بگریو بەشمان بکات .
- سوپاسی خوا دەکەین لەکۆتایی خواردن چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ (الحَمْدُ لله الذي أطعَمَنا وَسَقانا وجَعَلَنا مِنَ المسْلمِينَ) رواه أبو داود والترمذي. واتە: سوپاس بۆ خوای گەورە کە خواردنو خواردنەوەی پێ داینو ئێمەی گێڕا بە موسڵمان).
- دەستمان دەشۆین پێش نان خواردنو پاش خواردن.

**من منالّی موسڵمانم ناوی خوا دێنم لەکاتی خواردنو بەدەستی راست دەخۆم**

## هەڵسەنگاندن

**١** ووشەی (بەڵێ) بەرامبەر وەڵامی راستو ووشەی (نەخێر) بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ

- لەکاتی خواردن ئەم کردەوانە دەکەین
- بە دەستی چەپ دەخۆین
- بەدەستی راست دەخۆین
- ناوی خوا دێنین
- گەدەی خۆمان پڕدەکەین ناهێڵین شوێنی ئاو ببێتەوە.

**٢** دەستەواژەی ستونی راست بگەینە بە گونجاوی خۆی لەستونی چەپ:

| | |
|---|---|
| ئەوەی لەپێشتەوەیە بیخۆ | بەقەد پێویستی مان بە خواردن |
| ئەگەر خواردنەکە گەرم بوو | ئەوە بخۆی کەلەپێشت دایە |
| قاپەکە هەندێ خواردن تێ دەکەین | چاوەنواری ساردبونەوەی دەکەین |

**٣** ئەم کردەوانەی خوارەوە ریز بکە لەکاتی دانیشتن لەسەر خوان:

- ناوی خوا دەهێنین.
- ئەوەی لەپێشمان دایە دەی خۆین
- دەستمان دەشۆین پاش نان خواردن.
- دەستمان دەشۆین پێش نان خواردن

**٤** ئەم فەرمودەیە لەبەر دەکەین

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ :

(بِحَسْبِ أبنِ آدم لُقيَمات يُقِمْنَ صلبهَ، فإنْ غَلَبتهُ نَفْسُه فَثُلثُ لِطعامِه وثُلث لشرابِه وثلث لنَفَسه).

## وانەی یازدەهەم

### ئادابی خواردنەوە



خانەوادەکە لەژورەوە دانیشتن، وە منالەکانیش خەریکی خواردنەوەی ئاوو چای بوون پاش ئەوەی کە خواردنیان خواردبوو.

باوك ووتی: پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: (سَمّوا الله إذا شَرْبتُم، احمَدُوا الله اذا انتَهيتُم)) رواه ابن عباس. واتە: ناوی خوا بهێنن لەکاتی خواردنەوەو سوپاسی خوا بکەن لەکۆتایی خواردنەوەدا.

دایك: ئاینی ئیسلام وای فێرکردوین کە بە جارێك ئاو نەخۆینەوە بەڵکو بە سێ جار بێت.

باوك: ئەی منالەکانم ئاینی ئیسلام چەندەها ئادابی بۆ داناوین لەکاتی خواردنەوەدا وە دیارترین لەئامۆژگاریەکانی ئەمانەن:

- ئەگەر خواردنەوەت خواردەوە بە دەستی راست بیگرە.
- کە دەخۆیتەوە نابێت هەناسەی تێدا بخۆیتەوە چونکە پێغەمبەری خوا نەهیو قەدەغەی کردووە لەهەناسەدان لەناو جامی ئاوخواردنەوە.
- ئەگەر شتێکی گەرمت بۆ هات چاوەنوار بکە با بگاتە ئەو سنوورەی کە بە کەڵکی خواردنەوە دێت ئەوجا بیخۆوە.
- کە تەواو بووی لەخواردنەوە سوپاسی خوا بکە، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرموێ:(الحَمْدُ للهِ الذي أطعَمَنَا وسقَانا وَجعَلَنا مِنَ المُسْلمينَ) رواه الترمذي.
- نابێت خواردنەوە لەقاپی گەورە یان سوراحی قورسو گران یان لەدەمی دۆڵکەو کوندە یان شەربەو گۆزە، چونکە عائیشە خان دەفەرموێ ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی کردووە لەخواردنەوە لەدەمی کوندەو گۆزە چونکە دەبێتە هۆی پیس بوونی خواردنەوەکە )رواه مسلم.

**من منالی موسڵمانم بە دەستی راست دەخۆمەوە و ناوی خوا دێنمو سوپاسی خودا دەکەم لەکۆتایی دا**

## هەڵسەنگاندن

١ ووشەی (رازیم) بەرامبەر وەڵامی راستو ووشەی (نارازیم) بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ.

لەکاتی خواردنەوەدا واباشە کە:

- خواردنەوەی ئاو یەك کەڕەت بخورێتەوە.
- خواردنەوەی ئاو بە دوو کەڕەت.
- بەسێ کەڕەت ئاو بخورێتەوە.
- لەدەمی دۆڵچەو سوراحی دەخۆینەوە.

٢ دەستەواژەی ستونی لای راست بگەینە بە گونجاوی ستونی لای چەپ:

| | |
|---|---|
| ئاودەخۆینەوە لەپەرداخ | نابێت و دروست نییە |
| ئاو دەخۆینەوە لە سوراحی | بەدەستی راست |
| پەرداخەکە دەگرین لەکاتی خواردنەوەکە | بەسێ کەڕەت |

٣ ئەو ووشانە بخەرە شوێنی راستی خۆی لەم رستەی خوارەوە:

قاپی خواردنەوە — دەخۆینەوە — هەناسەی تێدا

لەوکاتەی..........ئاوی لەناو ..................دەبێ........نەخۆینەوە

٤ ئەم فەرمودەیە لەبەر بکە:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموی (سمّوا الله اذا شربتم واحمدوا الله اذا انتهيتم).

## وانەی دوانزەهەم

# ئادابەکانی چوونە سەر ئاو( تارەت کردن )



ئیسلام سورە لەسەر ئەوەی بەرەو کردەوەی چاکمان ببات وە وامان لێ بکات پەیرەوی لێ بکەین تاکو خورەوشتی رۆژانەمان باش بێت و بەپێی فەرمانی ئیسلام هەنگاو بگرین.

وەلەو کردەوانەش چوونە سەر ئاو یان گەرماو.

موسڵمانی پاکو خاوێن بەردەوام پاکو خاوێنە لەپیسوپیسایی وە لەگەرماو دێتە دەرەوە پاکو خاوێنە وەلەسونەتەکانی چونە سەر ئاو یان گەرماو چوون بە قاچی چەپو گوتنی (اللهم اني اعوذ بك من الخُبْثِ والخَبَائِثِ) رواه البخاری ومسلم. واتە: خوایە پەنا دەگرم لەشەیتانی نێرو مێ.

وە بۆ ئەوەی موسڵمان دوور بێ لەپیسی دەبێ وابکا میزو پیسایی بەر جلو بەرگی نەکەوێت وە کۆتاییی هات لەسەر ئاو با ئەم کردەوانە بکات:

- پاش ماوەی پیسایی و میز لەخۆی لابدات.
- با باش دڵنیا بێت لەخاوێن کردنەوەی لاشەی پاش شوشتنی بە ئاو.
- دەستی بە ئاوو سابون بشوات.
- وەشوێنی خۆ پاک کردنەوەی خۆی بشوات بە ئاووەلەئادابی چوونە سەر ئاو نابێت قسە لەوێ بکات یان قورئان بخوێنێ یان وەڵامی سڵاو بداتەوە.
- وە کاتی دەرچوون بڵێ (خوایە سوپاس بۆتۆ کە پیسو پیسایت لێ لادام و لەش ساغیت کردم).

**من منالی موسڵمانم خاوێنم لەکاتی چوونم بۆ سەر ئاو وەلەکاتی دەرچونم**

## هەڵسەنگاندن

١ ووشەی (بەڵێ) بەرامبەر رستەی راستو ووشەی (نەخێر) بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ.

ئاو دەست شوێنێکی زۆر پێویستی یە لەماڵدا چونکە جێگای:

- خوێندنەوەیە.
- جێگای خۆ پاك كردنەوەیە.
- شوێنی پەیوەندی تەلەفۆنە لەگەڵ خەڵكان.

٢ لەكاتی دەرچوون لەئاودەست ئەم كارانە دەكەم بەریزەوە:

- شوێنی ئاو دەست پاك دەكەمەوە بە ئاو.
- دەستم دەشۆم بە ئاوو سابون.
- شوێنی لاشەم لەمیزوپیسایی پاك دەكەمەوە.

٣ ئەم فەرمودەیە لەبەر بكە:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ : (الحُمْد لِله الذي أذْهَبَ عَنِي الأذى وَعافَانِي).

٤ ئەم رستەیە رەنگ بكە:

المسلم طاهر دائماً من النّجاسة

# وانەی سیانزەهەم

## ئادابی نوستن




سەعید زۆربەی زۆری رۆژەكانی بە موتالای وانەی قوتابخانە بەسەر دەبرد وە هەروەها یاری تۆپی پێی كرد لەقوتابخانە وە پاش نان خواردن دیسان ئامادەی موتالای وانە بوو بۆ رۆژی داهاتووی قوتابخانە، لەپاشان جلی نوستنی لەبەر كردو بۆ ئەوەی زوو بخەوێ تاكو لەبەیانی زوو بەئاگا بێتەوە پاش ئەوەی كتێبەكانی رێخستو لەشوێنی خۆی داناو

- جلەكانی خۆی بە شوێنیێ هەڵواسی.
- پاڵ كەوت لەژێر پێخەفەكەی.
- هەندێ قورئانی خوێند.
- لەلای راست پاڵ كەوت.
- لەپاشان ئەم دوعایەی كردو (بِاسْمِكَ رَبِيَ وَضَعْتُ جُنْبِي وبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نفسي فاغفِرَ لها وإِنْ ارسَلتَها فاحْفظهَا بما تحفظ به عبادَكَ الصّالحين) رواه مسلم.

واتە: بەناوی تۆوە كەڵەكەم خستە سەر زەوی و بە فەرمانی تۆ بەرزی دەكەمەوە ئەگەر گیانی منت كێشا لەخەودا ئەوا لێم خۆشبە وە ئەگەر ناردتەوە بەبەری دا ئەوا بیپارێزە هەروەكو بەندە چاكەكانت پێ پاراستوە).

**من منالی موسڵمانم زوو دەخەوم و دوعای پێش نوستن دەخوێنم**

## هەڵسەنگاندن

**١ نیشانەی راست ( ✓ ) بەرامبەر وەڵامی راستو نیشانەی ( ✗ ) بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ.**

که دەچینه سەر جێگای نوستن ئێمه:

- دەست دەکەین بە نان خواردنی ئێوارە.
- دوعاو پاڕانەوەی پێش نوستن دەکەین.
- لەسەر لای چەپ دەخەوین.

**٢ ئەم وشانە بخەرەوە شوێنی خۆی لەم رستەی خوارەوەدا:**

| کتێبەکانم | قورئانی | نووستن |
|---|---|---|

کەدەچم بۆ ............ هەڵدەستم............ رێك دەخەمو لەپاشان چەندی بۆم بلوێ..........پیرۆز دەخوێنم.

**٣ ئەو دوعایەی نوستن لەبەر بکە:**

(بِاسْمِكَ اللهم وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ ارْفَعَهُ، انْ أَمسكْتَ نَفسي فاغفِر لَها وإنَّ ارسَلْتها فاَحفظَها بما تحفظ به عبادك الصالحين).

## وانەی چواردەهەم

### راستگۆیی



دایك چووه دەرەوه بۆ سەردانی دراوسێ یەکەیان وه منالەکانی جێ هێشت لەگەڵ یەکدا یاریان دەکرد وه لەم کاتەدا سەعد تۆپی پێ بوو هاته دەرەوه وەلەگەڵ منالەکان دەستیان کرد به یاری تۆپێن وه بەلێدانی تۆپێك که به ویستی خۆیان نەبوو تۆپ به پەنجەرەی ماڵەوه کەوت شوشەکەی شکا، وه لەم کاتەش دا دایکیان هاتەوه وتی کێ بوو پەنجەرەکەی شکاند؟

سەعد وەستاو وتی من ئەی دایکه وه بەپێ ناخۆشیەوه لەسەر ئەم کارەم دایکی ووتی راست دەکەیت ئەی سەعد بەراستی بورایی‌و لێت خۆش بووم.

خوای گەوره دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾التوبة.

واته: ئەی بڕواداران لەخوا بترسن‌و لەگەڵ راستگۆیان دابن .

سەعد:لەمەودوا دەبێ لەراستگۆیان بم وەلەهەمو کاروکردەوەیەکدا، وه تاماوم درۆنەکەم ئەی دایکه.

دایك: ئایا دەزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەچی وەسفی کراوه؟

سەعد: نازانم بەچی وەسفی کراوه پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی دایکه؟

دایك: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێیان دەگوت راست گۆی دەست پاك (الصادق الامین) لەگفت‌و گۆو کاروکردەوەی دا وەلەسەر ماڵ‌و سامانیان .

سەعد:دەبێ منیش وەکو پێغەمبەر راست گۆ بم چونکه راستگۆیی خورەوەشتێکه لەخورەوشتی موسڵمانان.

**من منالی موسڵمانم راستگۆم لەکارو کردەوه گفت و گۆدا**

## هەڵسەنگاندن

١ ووشەی (بەڵێ) لەبەرامبەر رستەی راستو ووشەی (نەخێر) بەرامبەر رستەی ناراست دابنێ لەمانەی خوارەوە:

سەعد راست گۆ بوو چونکە:

- دانی نا بەوەی کە پەنجەرەی شکاندوە ( )
- ووتی نازانم کێ شکاندویەتی ( )
- ووتی برام بوو شکاندنی ( )

٢ ووشەی (رازیم) یان (نارازیم) بەرامبەر رستەی گونجاو بنوسە .

ئەو راستیەی کەسەعد پێی جیا بۆوە لەبەر ئەوە بوو کە:

- براکەی تاوانبار کرد بە شکانی پەنجەرەکە ( )
- وای کرد دایکی متمانەی پێ بکات ( )
- بەردەوامی لەراستی لەهەموو کاروبارێکدا ( )

٣ ووشەی گونجاوی خوارەوە بخەرە شوێنی راستی لەم رستەی خوارەوە:

| دەست پاك بوو | پێغەمبەر موحەممەد | ڕاستگۆ |
|---|---|---|

خەڵكان وەسفی ................ (ﷺ) کرد بەوەی ............وەهەروەها وەسفی کرد بەوەی ...............

## وانەی پانزەهەم

### دەست پاکی (الامانة)



کۆمەلێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر هاتنە شاری مەدینە هەندێك ماڵو سامانی تاڵانی دەست کەوتی جەنگیان پێ بوو کە سوپای ئیسلام لەولآتی فارس بە دەستی هێنا بوو وەهێنایان لەمزگەوت دایان نا. وە لەم کاتە خەلیفەی موسڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب هاتە ژوورەوەو ئەمەی بینیو سەری سوڕما ووتی ئەم ماڵو سامانە چی یە. ئەوانیش ووتیان ئەمانە چەند پارچە زێڕێکە موسڵمانان دەستیان کەوتووە لەجەنگی ولآتی فارسەکان. ئینجا خەلیفەی موسڵمانان عومەر فەرمووی ئەو کەسانەی ئەم زێڕەیان لەولآتی فارسەوە گەیاندۆتە ئێرە ئەوانە بەراستی دەست پاکن.

عەلی کوڕی ئەبو تالیب کە لەوێ ئامادەبوو فەرمووی ئەی ئەمیری بڕواداران تۆ عەفوت فەرموو بە لێبوردنەوە ئەوە ماڵی ئەمانەتی موسڵمانانە. وە بەئەم جۆرە خورەوشتە چاکانە هاوەڵان ژیان، وە موسڵمانانیش لەپاش ئەوان وەلەسەر ئەم پەیرەوو پڕۆگرامە، پێویستە موسڵمانان لەسەری بڕۆن لەهەموو کاتو ساتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لا إيمان لمن لا أمَانةَ لهُ، ولا دِيَن لمنْ لا عَهْدَ لَهُ) رواه احمد. واتە: ئەو کەسە بڕوای تەواو نییە کە دەست پاکو ئەمانەت پارێز نەبێ وە ئەو کەسەش دینی نی یە کە عەهدو پەیمانی نەبێت.

ئەمانەت خورەوشتێکە لەسیفەتەکانی موسڵمانان بە درێژایی مێژوو وە هەر بەم سیفەتەش لەنێوان خەڵکی جیا دەکرانەوە.

**من منالی موسڵمانم دەست پاكو ئەمینم لەسەر ماڵو سامانو نهێنی خەڵكی**

## هەڵسەنگاندن

١ ووشەی (بەڵێ) بەرامبەر رستەی راستو ووشەی (نەخێر) بەرامبەر رستەی ناراست لەمانەی خوارەوە دابنێ.

عومەری کوڕی خەتتاب سەری سوڕما لەدیتنی گۆمەزی زێڕ لەناو مزگەوت:

- ○ چونکە زێڕی زۆر بوو.
- ○ چونکە ئەمانەی هێنابوویان بۆ مەدینە دەست پاك بوون.
- ○ چونکە نەیان خستە سندوقی موسڵمانان.

٢ ئەم دەستەواژانەی ناتەواون تەواویان بکە:

- ○ خەلیفەی موسڵمان ......................دەست پاك بوو.
- ○ ..........................ئەمین بوو.
- ○ ..........................ئەمینو دەست پاك بوون.
- ○ ..........................ئافرەتەکان ئەمین بوون.

٣ دەستەواژەی ستونی لای راست بگەیەنە بە ستونی لای چەپ:

| | |
|---|---|
| موسڵمانەکان جیادەکرانەوە | سیفەتێکە لەسیفەتەکانی موسڵمانان |
| ئەمانەت | داوای عەفوی کرد |
| عەفوت ووت | بەئەمانەت ولەسەر درێژایی مێژوو |

٤ ئەم فەرمودەیە لەبەر بکە:

قال رسول الله (ﷺ) (لاَ ايمانَ لِمَنْ لا أمَانَةَ لَهُ ولا دين لِمَنْ لا عَهَدْ لَهُ)

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (ئەو کەسە بڕوای تەواو نی یە کە ئەمانەتی لا نەبێت نەی پارێزێ هەر ئەو کەسەش دینی نییە کە عەهدو پەیمانی نەبێت.

## وانەی شانزەهەم

### دڵسۆزیو دڵ پاکی



صالح و ئوسامە دوو برادەر بوون کە هاتوو چۆی مزگەوتیان لەگەڵ یەکدا دەکرد وەیەکتریان خۆش دەویست لەبەر خوا وە کردەوەیان بە دڵسۆزی بۆ خوا دەکرد وە صالح دەرچوو بۆ جەنگ لەپێناوی خواماڵو مناڵەکەی سپارد بە خوای گەورە وە ئوسامەی برادەریشی پەیمانی دا کەسەرو کاری ماڵ سەرف کردن بۆیان بکاتو یارمەتیان بدات.

وەئوسامەی برادەری هەڵسا بە دابین کردنی ئەو برە پارەیەی کە لەموچەی مانگانەی وەری دەگرت بۆ دوو بەش بەشێکیان بۆ ماڵو مناڵەکەی وە بەشەکەی تری بۆ ماڵو مناڵی صالح بەخشی، خێزانی ئوسامە ووتی بە مێردەکەی ئێمە چۆن بە نیو مووچە دەژین ئوسامە لەوەڵامدا ووتی ئەی بنەماڵەی صالح چۆن بێ موچە دەژین بەڵام ئوسامە لەئیسلام فێری دڵ سۆزیو دڵپاکی بوو بۆ خواو بۆ برادەرەکانی.

ئوسامە فەرموی: ئێمە پەیمانمان داوە بە خوا لەسەر سەرخستنی دینی خوا ، خوای گەورە دەفەرموێ :﴿ وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ ۝٨ ﴾الحشر.

ئا ئەوانە ئایینی خواو پێغەمبەرەکەی سەر دەخەنو ئا ئەوانە لەراستگۆیانن)ئێمە برادەری یەکدین کە لێك دووربینو یارمەتی یەکتری دەدەین کە گەیشتین بە یەکتر.

وە دڵسۆزی موسڵمان بۆ موسڵمانان بە گشتی بەوەیە کە گرنگی بە یەکتری بدەن چونکە پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (مَنْ لَمْ يَهْتَم بِأمرِ المسُلمَين فَلَيَس مِنْهمُ) رواه البيهقي والطبراني . (کەسێ گرنگی بە کاروباری موسڵمانان نەدا لەوان نیە)

**من مناڵی موسڵمانم دڵسۆزم لەهەموو گفتو کردەوەیەکدا**

## هەڵسەنگاندن

١ ووشەی (بەڵێ) بەرامبەر رستەی راستو ووشەی (نەخێر) بەرامبەر رستەی ناراست دابنێ.

ئوسامە دڵسۆز بوو بۆ صالحی برادەری چونکە:

- چونکە پەیمانی دابوو بەماڵ سەرف کردن بۆ خانەوادەی صالح.
- باسیانی دەکرد لەهەندێك کاتدا.
- موچەی خۆی کردە نیوە بۆ خۆیو خانەوادەی صالح.

٢ ئەم دەستەواژە ناراستانە تەواو بکە:

موسڵمان دڵسۆزە بۆ ماڵو منالی وە بۆ ................وە بۆ...............وە بۆ...............وە بۆ...............بۆ موسڵمانان بە گشتی.

٣ ئەم دەستەواژەیە مانای چییە؟

ئوسامە بە خێزانەکەی ووت: (خانەوادەی برادەرم صالح چۆن بێ موچە دەژین).

٤ ئەم رستەیە رەنگ بکە:

تذكر الصديق اذا غاب وترعاه اذا حضر

## وانەی حەڤدەهەم

### ئازایەتی (الشجاعة)



ئازایەتی ئەوەیە کەسێك بۆ شتێك بچێت کە بیەوێتو بێ ترس بۆی بچێت وە هەوڵی شکاندنی هەڵوێستێکی سەختی دا.

وەموسڵمانان بەردەوام لەئازایەتی دا بوونو رۆڵێکی گرنگیان بینی وەلەسەرەتادا پێغەمبەری خوا ئازاترین کەسە وە عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆمان دەگێڕێتەوە لەئازایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ ئەگەر شەڕ گەرم بونایە خۆمان بەو دەپاراست وە کەسمان لەو نزیکتر نەبوو لەشەڕد، وە ئەگەر مێژوو بخوێنینەوە چەندە سوارچاکو ئازایەتی موسڵمانان تۆمار کراوە لەجەنگەکانی ئازادکردنی وڵاتان بە دەست موسڵمانانەوە.

لەو کاتەی خالیدی کوڕی وەلید داوای یارمەتی لەخەلیفەی موسڵمانان کرد کە سوپایەکی بەهێزی بۆ بنێرێ ئەویش سەرکردەیەکی ئازای بۆ نارد کە میقدادی کوڕی ئەسوەد بوو.

وە ئازایەتی بە تەمەن نی یە، ئا ئەوە خالیدی کوڕی وەلید دەفەرموێ: لەوکاتەی مەرگ یەخەی پێ دەگرێ هیچ شوێنی لەلاشەی من نەماوە کە تیر یان شیر یان رمی پێ نەکەوت بێ وە ئێستا من لەسەر جێ و بانەکەی خۆم دەمرم هەروەکو حوشتر دەمرم وەچاوی ترسنۆکان قەت خەوی لێ ناکەوێ.

وەلەئازایەتی ئەوەیە کە ئەنجامەکەی جەنگ هەر چۆنێك بێت موسڵمان ئازایەو وەلەدەربڕینی رەئیو لەهەڵوێستی سەخت دا.

**من منداڵی موسڵمانم ئازاو چاونەترسم لەخوانەبێت لەکەس ناترسم**

# هەڵسەنگاندن

١ نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر رستەی راستو نیشانەی (✗) چەوت بەرامبەر رستەی چەوت دابنێ لەوانەی خوارەوە:

، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەهەموو کەس ئازاتر بوو چونکە:

- ○ نزیکترین کەس بوو لەدوژمن.
- ○ باسی ئازایەتی دەکرد.
- ○ جەنگاوەران لە هاوەڵان خۆیان بەو دەپاراست.

٢ ئەم ووشانەی ناتەواون تەواو بکە....لەهەڵوێستی ئازایەتی، ئازایەتی بوو:

- ○ لەشەڕدا
- ○ ....................
- ○ ....................

٣ ئەم وشانە بخەرە شوێنی گونجاو لەم رستانەی خوارەوە:

| هەڵوێستەکان | بەرەو پێش | ترس |
|---|---|---|

ئازایەتی ئەوەیە کە.............بچێت بۆ شتەی دەیەوێ بەبێ...............وەنەترسێ...............سەختو دژوار.

٤ چۆن زانیمان کە سەرکردە خالیدی کوڕی وەلید ئازاو سوارچاك بوو...............

## وانەی هەژدەهەم

### مل کەچی (التواضع)



پێغەمبەری خوا (ﷺ) مل کەچ و بێ فیز بوو ئەو جل و بەرگەی لەبەری دەکرد کە خەڵکی لەبەریان دەکرد وە شت و مەکی خۆی بە دەستی خۆی هەڵدەگرت وە وەکو خەڵکان خواردنی دەخواردو خەڵکی چ خواردنێك بخۆن ئەویش ئەوی دەخوارد.

وە بێ فیزی و مل کەچی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەبوو ئەگەر لەناو هاوەڵان دانیشتبا یەکێك لەدەرەوە هاتبا نەی دیبا نەی دەزانی کامیان پێغەمبەرە وە تەماشای خەڵکی دەکرد و دەیگوت کامتان موحەممەدن وەپیاوێ هاتە لا ی کە چاوی پێ کەوت دڵی لەرزی و ترسا، پێغەمبەری خواش فەرمووی مەترسێ من کوڕی ئافرەتێکم لەقوڕەیش کە گۆشتی ووشکراوی دەخوارد(القدید) وە هاوەڵانیش وەکو ئەوبوون لەمل کەچی و بێ فیزی وەلەنمونەی مل کەچی هاوەڵان دا:

- گەورەمان فاتیمەی کچی پێغەمبەر جۆی دەکردە ئاردو بە دەستی خۆی هەویری دەشێلا.
- وەلەمل کەچی عومەری کوڕی خەتتاب کە دەچووە سەر مینبەر وتاری دەدا دەیفەرموو من لەپێش دا شوانی فلانە کەس بووم وەکرێ یەکەشم چەند دەنکە خورمایەك بوو.

وەپیاوی مل کەچ خۆشەویستی خەڵکی یەو نزیکە لەخوا ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیفەرموو: (ما تَواضَعَ احَد للهُ إلا رفعه الله) رواه مسلم.

کەسێ لەبەر خوا مل کەچ و بێ فیز بێت خوای گەورە سەری بەرز دەکات لەرۆژی دوایی دا.

**من منداڵی موسڵمانم حەزدەکەم مل کەچ بم لەگەڵ بێ فیزان دابم**

## هەڵسەنگاندن

١ نیشانەی راست ( ✓ ) بەرامبەر رستەی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر رستەی ناراست دابنێ:

پێغەمبەری خوا ﷺ مل کەچ بوو وە لەنمونەی مل کەچی ئەوە بوو کە:

- کەلو پەلی بە خۆی هەڵدەگرت.
- جلو بەرگی وەکو خەڵکی لەبەر دەکرد.
- خواردنی تایبەتی دەخوارد.

٢ چۆن زانیمان فاتیمەی کچی موحەممەد مل کەچ بوو؟

٣ عومەری کوڕی خەتتاب مل کەچ بوو چۆن زانیمان؟

٤ بۆچی کەسێ لەدەرەوەی مەدینە هاتبا پرسیاری دەکرد کامتان موحەممەدن؟

## چاوپۆشی و لێبوردەیی (التسامح والعفو)

لەوکاتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە شاری مەککە کە ئازادی کرد و سەرکەوت چاوپۆشی لەخەڵکەکەی کردو پێ یانی فەرموو (ئێوە گومانتان بە من چی یە، چیتان لێ بکەم؟ وتیان: تۆ برای بەڕێزی و کوری برای بەڕێزی ئێمەی، فەرمووی: بڕۆن وا ئازادم کردن.

ئەوە چاوپۆشی و لێبوردەیی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو.



وەهەروەها زانیمان کە پیاوێ بە ئۆتۆمبێڵەکەی لەمناڵێ نا کوشتی بە روداوی ئۆتۆمبێڵ وەلەئەنجامدا باوکی مناڵەکە وەستاو پێش ئەوەی کۆرپەکەی بنێژرێ لەگۆڕدا فەرمووی سوێندم بە خوا نابێ بینێژن تاوەکو شوفێرەکە لەبەندیخانە نەیەتە دەرەوە وەلەم کاتەدا پیاوانی پۆلیس هەڵسان شوفێرەکەیان هێنا سەر گۆڕی مناڵەکە و بەرەڵایان کردو وە لەم کاتەدا باوکی مناڵەکە فەرمانی ناشتنی مناڵەکەی داو ە ووتی ئەم کورەی من بە هۆی تۆوە مردووە وە ئەوەش قەزاو قەدەری خوا بوو وە منیش لێت دەبورم بەهۆی پابەندبونم بە ئایینی پیرۆزی ئیسلامو پێغەمبەرەکەی وە خەڵکانیش زۆر سەریان سوڕما لەم هەڵوێستەی پیاوەکە وە بەدەم خوێندنی ئەم ئایەتەوە گەڕانەوە بۆماڵەوە، کە خوا دەفەرموێ:

﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾﴾ آل عمران.

واتە: ئەوانەی تورەیی خۆیان قوت دەدەنەوەو لەخەڵکان دەبورن وە خوای گەورە چاکەکارانی خۆش دەوێن.

**من مناڵی موسڵمانم حەزدەکەم لەخەڵکان ببورم وریزیان بگرم**

## هەڵسەنگاندن

**١** ووشەی (بەڵێ) بەرامبەر رستەی راستو ووشەی (نەخێر) بەرامبەر وڵاتی چەوت دابنێ:

لەو کاتەی پێغەمبەری خوا چووە نێو شاری مەککە چاوپۆشی لەخەڵکان کرد و پێی فەرموون:

- ○ لەئایندەدا بەندتان دەکەم.
- ○ بڕۆنو ئازادم کردن.
- ○ماڵو سامانتان بە شاڵاو دەبەم.

**٢** ووشەی گونجاو بخەرە ئەم بۆشایانەی خوارەوە :

باوکی مناڵە کوژراوەکە چاوپۆشی کرد چونکە:

- ○ کوژەرەکەی لەبەندیخانە دەرهێنا.
- ○ ..................................
- ○ ..................................
- ○ ..................................

**٣** ووشەی گونجاو لەشوێنی گونجاو دابنێ:

| سەریان سوڕما | چاوپۆش | ئیسلامی |
|---|---|---|

خەڵکان ..........لە..........باوکی مناڵە کوژراوەکەو بەهۆی پابەندبوونی بە ئایینی پیرۆزی ................................ .

**٤** ئەم ووشانە رەنگ بکە:

لقد عفوت عنك متأسيا
برسول الله عليه السلام



## وانەی بیستەم

## ئارام گری (الصبر)



ئارامگری سیفەتێکە لەسیفەتەکانی لەکۆڵ گرتنی ئەزیەتو ناخۆشیەکان کە بەرەو رووی ئادەمیزاد دەبێتەوە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەهەموو کەس بە ئارام گرتر بوو، ئەوەبوو لەماوەی ساڵێکدا خەدیجەی خێزانیو مامی ئەبوتالیب کۆچی دواییان کرد کە هەردوکیان مایەی پشتو پەنای بوون بۆی وە هەروەها شاعیری موسڵمان خاتوو (الخنساء) صەبرو ئارامی گرت لەسەر شەهید بوونی چوار کوڕی لەشەڕێك لەشەڕەکانی ئیسلام وە فەرمووی (الحمد لله الذي شرفني بقتلهم) واتە سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە سەربەرزی کردم بە کوشتنی کوڕەکانم لەپێناوی خوا وە خوای گەورە دەفەموێ: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ (١٠)﴾ الزمر. واتە: ئەوانەی صەبرو ئارام گرن پاداشتی بێ بڕانەوە وەردەگرن.

وەلەسیفەتەکانی موسڵمانان: صەبرو ئارام گرتن لەسەر برسێتیو ئازاری بێ بڕواکان و لەسەر تێنوێتی لەبەرۆژوو بوون لەمانگی رەمەزان وە لەجگەلەمانگی رەمەزانیش پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوەسفی پیاوی رۆژوەوان دەفەرموێ (فإن سابه أحد أو شاتمه فليقل إني أمرؤ صائم). واتە: ئەگەر کەسێك ئازاری دای یان جوێنی پێ دا با بڵێ من بەرۆژووم. هەروەها صەبرو ئارامگری لەسەر دراوسێی خراپ ولەسەر هەژاریو دوورکەوتنەوە لەماڵو مناڵ وەصەبر یەکێکە لەسیفەتەکانی موسڵمانان کە پێ یەوە دەناسرێنەوە لەهەموو چەرخو زەمانێکدا.

**من مناڵی موسڵمانم ئارام دەگرم لەهەڵوێستە سەختەکان**

## هەڵسەنگاندن

١ نیشانەی راست ( ✓ ) بەرامبەر وەڵامی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ لەمانەی خوارەوە:

شاعیری ئیسلام خاتوو خەنساء لەئافرەتە ئارام گرەکان دابوو لەکاتی شەهید بونی هەرچوار کوڕەکانی:

- ○ چونکە ئیسلام فێری ئارام گری کردبوو.
- ○ چونکە ئەوانە چوونە بەهەشت.
- ○ چونکە لەتۆڵەی ئەوان بە خششی وەرگرت.

٢ ئەم رستەیەی خوارەوە تەواو بکە:

ئارام گری چەند جۆرێکن لەوانە:

- ○ ئارام گرتن لەسەر ئازار.
- ○ ئارام گرتن لەسەر..............................
- ○ ئارام گرتن لەسەر..............................
- ○ ئارام گرتن لەسەر ..............................

٣ ئەم وشانە لەشوێنی گونجاو دابنێ لەم رستەی خوارەوە:

| خێزانەکەی | مامەکەی | موحەممەد |
|---|---|---|

خورەوشتی..................(ﷺ) ئەوەبوو لەهەموو کەس بە ئارام تر بوو ئەوەبوو لەساڵێکدا .......................... ئەبوتالیبو........................خەدیجە کۆچیان کرد.

## وانەی بیست و یەك

### بەزەیی (الرحمة)



بەزەیی سیفەتێکە لەسیفەتەکانی خوای گەورە، خوای گەورە (الرحمن الرحیم)ە وە هەر ئەو ئایەتەیە کە لەهەموو رەکعاتێك لەنوێژدا دەی خوێنین وە لەرەحمەتیو بەزەیی پەیامی ئیسلامە کە خوای گەورە ناردویەتی بۆ سەر دڵی پێغەمبەر کە خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ الأنبیاء.

واتە: تۆمان رەوان کردووە بۆ هەموو خەڵکی بەرەحمەتو بەزەیی بۆ هەموو جیهانیان.

وەئیسلام داوای بەزەیی لەئێمە کردووە لەگەڵ یەکدا، پێغەمبەری خوا دەفەرموێ:

(الراحمون یرحمهم الله، ارحموا من في الأرض یرحمکم من في السماء) رواه مسلم.

بەبەزەییان، خوا رەحمیان پێ دەکات، بەزەییو بەرەحم بن لەسەر زەوی تا خوا لەئاسمانەکان رەحمتان پێ بکات.

موسڵمان بەزەیی بە ئاژەڵان دا دێتەوە، رۆژێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبوو لەنێوان هاوەڵان دا وشترێك هاتە لای پێغەمبەرو شکاتی حاڵی خۆی کرد ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی کێ لەئێوە بەچکەی ئەم وشترەی لای خۆی داناوە با بۆی بنێرێتەوە.

وەئیسلام ئامۆژگاری کرد بەبەزەیی بن بە هەژارانو بێ نەوایانو هەتیوان وە رەحمەتو بەزەیی سیفاتی موسڵمانانە.

**من منالی موسڵمانم بەزەیی دەبم بەرامبەر ئادەمیو ئاژەڵان**

## هەڵسەنگاندن

١ نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر وەڵامی راستو ونیشانەی (✗) چەوت بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ.

ئیسلام هەڵگرانی خۆی ئامۆژگاری دەکات بە بەزەیی بن بەرامبەر :

- ○ بێ هێزان.
- ○ ئاژەڵان.
- ○ بەردەکان.

٢ رەحمەت لەسیفاتی موسڵمانە تۆش چوار لەم جۆرە رەحمەتانە بنوسە:

- ○ رەحمەت و بەزەیی بە منالاَن.
- ○ ..................................
- ○ ..................................
- ○ ..................................
- ○ ..................................

٣ ئەم فەرمودەیە لەبەر بکە:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (الراحمون يرحمهم الله، ارحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء).

## وانەی بیست و دووەم

### نەرمو نیانی (الرفق)



ئاینی ئیسلام وەسیەتی بە موسڵمانان کردووە بە نەرمو نیانیو بەبەزەیی، وەلەسیفەتەکانی چاکەیە کە موسڵمانان لەزووەوە پەیڕەویان کردووە هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إن الرفق لا يكون في شيء إلا زَانَهُ وما نزع من شيء إلا شانه) واتە: نەرمو نیانی لەهەر شتێکا بێ ئەوە جوانو بەنرخی دەکات و لەهەر شتێ دانەبوو ئەوە سوکو چروکی دەکات.

وەموسڵمان هاوەڵی برای ئادەمی خۆیەتی پێویستی بە یارمەتی یەکتری هەیە وە دەبێ رێنیشان دەری رێگای وون بووی برادەرەکەی بێت وە یارمەتی بدات بۆ هەڵگرتنی کەلو پەلی براکەی وبارسوکی براکەی وەموسڵمان دەبێت دەستی نابیناش بگرێ لەشەقام بیپەڕێنتەوە.

وەهەروەها موسڵمان دەبێ یارمەتی ئاژەڵانیش بدات نەرمو نیان بێتو ئازاریان نەدات وە پێغەمبەری خوا باسی ئافرەتێك دەکات کە بە هۆی پشیلەیەك چووە دۆزەخ کە بەندی کرد نەی هێشت نە بەرەڵای کرد کە رێگە بگرێ خواردن بخوات وە نەخواردنی بۆ هێنا تاکو پشیلەکە مرد.

هەروەکو دەفەرموێ: (دَخَلَتِ امرأة النّار في هِرةٍ حَبَسَتْها فلا هي أطْعَمتَها ولا هي تَركَتها تاكُلُ مِنْ خشاشِ الأرضِ) رواه مسلم.

**من منداڵی موسڵمانم نەرمو نیانم بەرامبەر ئادەمیو گیانەوەران**

## هەڵسەنگاندن

١ ووشەی (رازیم) لەبەرامبەر رستەی راستو ووشەی (نارازیم) بەرامبەر وشەی ناراست دابنێ لەمانەی خوارەوە:

نزیکترین مانا بۆ نەرمو نیانی ئەوەیە:

- ○ یارمەتی دان
- ○ بەبەزەیی
- ○ گوێ لێ بوون

٢ هەر رستەیەك بگەیەنە بە رستەی گونجاوی بەرامبەری لەمانەی خوارەوە:

| | |
|---|---|
| موسڵمان نەرمو نیانە | چونکە پشیلەی بەند کرد تاکو مرد |
| نەرمو نیانی | بەگیانەوەران |
| ئافرەتێك چووە دۆزەخ | کردەوەکان دەڕازێنێتەوە |

٣ ئەم فەرمودەیە لەبەر بکە:

قال رسول الله (ﷺ) (دَخَلَتِ امرأة النار في هـرة حَبَسَـتها فَـلا هـي أطعَمتهـا وَلا هـي تَركَتهـا تأكل من خشاش الأرض) رواه مسلم.

# وانەی بیست و سێ یەم

## بەشی یەکەم

## چاکە کردن لەگەڵ دایكو باوك



لەگەیشتنە نیوەی شەودا بوو دایکی خالید خەوی لێ نەکەوت، لەبەر ئەوەی خالید نەخۆش کەوتبوو ئازاری لەلاشەی هەبوو، بەڵام باوکی خالید خەریکی بانگ کردنی پزیشك بوو بۆی وەلەکاتی بەرەبەیان دا خالید حالی باش بوو. ئەوەیە وەزعو حالی دایكو باوکان کە هەرچی لەتوانایان بێت دەیکەن بۆ منالەکانیان، ئەی منالان چی یان لەسەرە بەرامبەر ·دایكو باوکیان بیکەن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا ﴿٢٤﴾ ﴾الإسراء. واتە: باڵی خۆ بە کەم زانینو میهرەبانیتان بۆ راخەن وە بڵێ ئەی پەروەردگارم رەحمیان پێ بکە هەروەکو چۆن ئەوان بە منالی منیان پەروەردەکرد.

وەچاکەی منالً لەبەرامبەر بە دایكو باوکیان:

- گوێڕایەڵی هەر فەرمانێك بکەن.
- بەجێ گەیاندنی هەر داواکاریەك لەلایەن منالەکانەوە
- کارکردن بۆ رازی کردنیان
- نابێت پشتیان تێ بکری لەسەر فەرمانیان

وەچاکەی دایكو باوك بەرامبەر نەوەکانیان و هەست بریندارنەکردنو وەهاوەڵان نانیان نەدەخوارد مەگەر لەگەڵ دایكو باوکیان نەبا وە ئەوەی دڵی دایكو باوکی بڕەنجێنێ ئایینی ئیسلام پێی دەڵێ (العاق لأبويه) واتە: دڵ شکێنەری دایكو باوك.

**من منالی موسڵمانم بە گوێی دایكو باوکم دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

**١** نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر رستەی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر رستەی چەوت دابنێ:

ئیسلام ناوی لەو کەسەی ناوە کە فەرمان بەرێتی دایکو باوکی ناکات :

- ○ خراپ
- ○ پشت گوێ خستن
- ○ دڵ شکێنەری

**٢** ئەو وشانەی گونجاوە بخەرە شوێنی راستی گونجاوی خۆی:

پشت تێ کردن | چاکە کردن

لەجوانی ..........دایک وباوک نابێت...............لەسەر فەرمانیان

**٣** ئەم رستانەی خوارەوە تەواو بکە،

ئێمە بە گوێی دایکو باوکمان دەکەین لەبەر ئەوەی

- ○ شەونخونی دەگرن بۆ ئیسراحەنی ئێمە
- ○ ........................................
- ○ ........................................
- ○ ........................................

**٤** ئەم ئایەتە لەبەر بکە:

﴿ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾ الإسراء.

## وانەی بیست و چوارم

### بەشی دووەم
### چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوك



فەرمان بەرێتی دایكو باوك بەردەوام لەسەریانە هەتاکو ئەگەر لەتەمەنی پیریو هەتاکو لەدوای مردنیش پێویستە لەسەر منداڵەکانیان ، وە باوك زۆر ماندوبوون دەبەخشێ بەرامبەرکۆرپەکانیان وەهەروەها دایك ئازارو ئەزیەت دەچێژێ بەرامبەر نەوەکانیان وەلەسەر منداڵەکانە کە پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکەن دەرهەق بە دایكو باوکیان:

- گفتو گۆ کردن بە نەرمو نیانی.
- گوێ گرتن لەکاتی قسەکردنیاندا.
- نزاو پاڕانەوە بۆیان لەپاش مردنیاندا.
- جێ بەجێ کردنی داواکاریان.
- هەوڵ دان بۆ رازیبونیان.
- رێزگرتن لەبرادەرەکانیان چ لەپێش مردنیان یان لەپاش مردنیاندا.

بەڵام دایك شوێنی زیاتر و تایبەتی تری هەیە چونکە پیاوێ هاتە لای پێغەمبەری خوا فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا کێ نزیکترە چاکەی لەگەڵ بکەم ، فەرمووی : دایکت پاشان فەرمووی کێ لەپاشان فەرموی دایکت ، لەپاشان فەرمووی کێ؟ دیسان فەرموی دایکت. لەپاشان فەرموی باوکت. رواه مسلم.

**من موسڵمانی موسڵمانم فەرمان بەرداری دایكو باوکم دەبم چ لەژیاندا وە چ لەدوای کۆچیان دا**

## هەڵسەنگاندن

**١** ووشەی (بەڵێ) بەرامبەر رستەی راستو ووشەی (نەخێر) بەرامبەر ووشەی چەوت دابنێ.

أ. لەو کاتەی دایكو باوك گەورەو بەساڵاچوو دەبن پێویستە چاودێریان بکەین وەکو:

- گفتو گۆیان لەگەڵ بکەین بە نەرمو نیانی .
- سەردانی بکەین ساڵی جارێك.
- رێزگرتنی برادەرەکەیان.

ب. چاکەکردن لەپاش مردنیان بە دوعاو نزا بۆ کردنیان.

**٢** ئەم بۆشاییانە پربکەرەوە:

ئێمە چاکە بەرامبەر دایكو باوکمان دەکەین چونکە:

- ○ ماندوبون لەبەر ئێمە.　○ ..............................
- ○ هەڵساون بەپەروەردەکردنمان　○ ..............................

**٣** وشەی گونجاو لەشوێنی گونجاو دابنێ:

باوکت　دایکت　دایکت　دایکت

نزیکترین کەس بە چاکە لەگەل کردن............ لەپاشان ..............لەپاشان..............لەپاشان..............

**٤** ئەم ووشانەی رستەکە رەنگ بکە:

نكرم والدينا بالطاعة
ونعمل ما يرضيهما



## وانەی بیست و پێنجەم

### سەردانی خزمو خۆیش



لەیەك لەبۆنەكان خانەوادەكە لەماڵی باپیرو داپیرە كۆبونەوە وە هەمویان دڵخۆش بوون بەم بەیەك گەیشتنە وە لەم كۆبونەوەدا پێك هاتبوون لەمامو مامۆژنەوخاڵو پوورو هەموو مناڵەكانیان وەپلەی خزمایەتی كۆی كردبونەوە بەم كۆبونەوەیە دڵخۆش بون وە ئیسلام پێویستی سەرشانی ئێمەی كردوە لەپارێزگاری پەیوەندی خزمایەتی بكەین كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ باللهِ واليَوْمِ الآخرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ) رواه مسلم. كەسێ بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێت با سەردانی خزمو خۆیشی بكات.

وە هەتاكو پارێزگاری لەخزمایەتی بكەین دەبێت ئەم كارانە بكەین :

- سەردانی كردنیان لەهەموو بۆنەیەك دا.
- سەردانو هەواڵ پرسین.
- بانگ كردنیان بۆ هەموو بۆنەكان.
- پێش كەش كردنی یارمەتی بۆیان.

وەكەسێ واز لەخزمو خۆیشی بهێنێ موستەحەقی توڕەیی خوایە هەروەكو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا يَدْخُلُ الجَنةَ قَاطعٌ) رواه مسلم.

واتە: ئەو كەسە ناچێتە بەهەشت كە سەردانی خزمان بپچڕێنێ.

وە هاموشۆی خزمان مایەی رزقو ڕۆزی زیادبونە چونكە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ كەسێ پێی خۆشە رزقو ڕۆزی زیاد بێت با سەردانی خزمو خۆیشی بكات. رواه مسلم.

**من مناڵی موسڵمانم هاموشۆی خزمان دەكەم**

## هەڵسەنگاندن

١ نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر دەستەواژەی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ.

سەردانی خزمو خۆیشی دەکەین بەشێوەی خوارەوە:

- سەردانیان دەکەین لەتەمەنی جارێك.
- لەهەموو بۆنەیەك سەردان دەکەین.
- باسی هەندێك ناو دەکەین.

٢ وشەی گونجاو بخەرە شوێنی گونجاو لەرستەی خوارەوە:

| وازهێنان | بەهەشت | بڕینی هاموشۆ |
| --- | --- | --- |

کەسێ...............لەخزمو کەسەکانی ئیسلام پێی دەڵێن...............وە ناچێتە ...................وە.

٣ لەوناوانە بنوسە:

مامەکانم.....................و......................و......................

پورەکانم.....................و......................و......................

خاڵەکانم.....................و......................و......................

پورەکانم خوشکی دایك...............و...............و......................

## وانەی بیست و شەشەم

### رێز گرتنی گەورە



یەك لەقوتابییەكان پێشنیاری ئەوەی كرد بە هاوڕیەكانی كە سەردانی یەك لەگەورەكانی ئەو گەرەكە لەماڵەوەی بكەین بۆ گوێ لێ گرتنی بۆ گێڕانەوەی تاقی كردنەوەی ژیانی.
وە خەڵكان ڕێزی گەورە دەگرن لەبەر بەڕێزو شكۆمەندی وەگەورەش گەورەی تەمەنە وە گەورەیی ڕێزو شەرەفە وە گەورەی زانیاری و زانستە. وەكو مامۆستای پیاوو ئافرەت وەبەڕێوەبەری قوتابخانە لەبەر ئەوە پێویستە مامەڵە لەگەڵ گەورە بكەین بە هەموو ڕێزگرتنەك. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی(لَيْسَ مِنا من لَمْ يَرحَم صغيرنا ويَعْرِفُ قَدر كَبيرِنا) رواه الترمذي. واتە: ئەو كەسە لەئێمە نی یە كە بەزەیی نێتەوە بە بچوكان و ڕێزی گەورە نەگرێت.

- دەبێت گەوران جگە لەووشەی جوان زیاتر گوێ بیستی شتی تر لەئێمە نەبێت.
- ئەگەر خەڵكان چوونە ماڵەوە یان نادیو، شوێنی ئاهەنگ، و كۆبونەوە با گەورەكان پێش وەخت بچن.
- ئەگەر گەوران چوونە ژوورەوە دەبێ لەشوێنی سەرەوە دابنیشین.
- ئەگەر خواردنەوەی میوانداری دانرا دەبێ لەپێشدا بۆ گەوران دابنرێ.
- ئەگەر خواردن دانرا پێش وەخت بۆ گەوران دابنرێ.
- ئەگەر سواری پاس یان شەمەندەفەر بووین لەپێش دا گەورەكان لەشوێنی خۆش بن.

**من منالی موسڵمانم ڕێزی گەورەو بەزەییم بە بچوكان دێتەوە**

## هەڵسەنگاندن

**١** دەستەواژەی (بەڵێ) بەرامبەر وەڵامی راستو دەستەواژەی (نەخێر) بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ.

ئەگەر یەکێکی گەورە هاتە ماڵەوەمان واجیبمان ئەوەیە:

- پرسیاری تەمەنی لێ بکەین.
- لەشوێنی سەرووی دانیشتن دابنێین.
- ئاوی پێ بدەین.

**٢** ئەو ووشە ناتەواوانە تەواو بکە:

گەورە لەکۆمەڵگە کە رێزی لێ دەگرین ئەوەیە :

- تەمەنی گەورە بێت
- گەورەی ......................
- گەورەی........................
- گەورەی........................

**٣** ئەم ووشانە رستەیەکی تەواوی لێ دروست بکە:

| گەورە | سواری دەبێت | پاس | لەوکاتەی |
|---|---|---|---|
| شوێنی خۆش | شوێنی | لە | کاتی دانیشتن |

**٤** ئەم رستەیە رەنگ بکە:

نجلس مع الكبير
لنستفيد من تجاربه



## وانەی بیست و حەوتەم

### ئادابەکانی فێرخواز (طالب العلم)



ئیسلام داوا دەکات هەوڵی زانیاری پەیداکردن بدەین وە بەڵێنی داوە بە زانایان بەپلەی بەرز لەلای خوا ، خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾﴾ المجادلة. خوای گەورە، بەرز دەکاتەوە پلەی ئەوانەی بڕوایان هێناوە لەئێوەو ئەوانەی عیلمو زانیاریان پێ بەخشراوە. وەئاینی ئیسلامیش هەوڵی داوەو وەعدەی داوە بە کەسێ داوای عیلمو زانیاری بکات بە چوونی بۆ بەهەشت ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ : (مَنْ سَلَكَ طرِيقاً يَطْلُبُ فِيه علماً سَهَّلُ الله به طَرِيقاً إلى الجنّة) رواه الترمذي. کەسێ ڕێگایەك بگرێ بۆ هەوڵی زانیاری وەرگرتن ئەوا ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکرێت.

وەلەئادابەکانی فێرخواز:

- زانیاری وەردەگیرێ لەهەر سەرچاوەیەك بێت.
- چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: (الحِكْمةُ ضّالة المُؤْمِنِ أنّى وَجَدَهَا فُهو أحقَ النّاس بها). دانایی بزربوی ئیمانداره لەهەر کوێ یەك دەستی کەوت ئەوا خۆی لەپێش ترە لەخەڵکی زیاتر.
- هەوڵ دان بۆ عیلم فەرزەو پێویستە لەسەر هەموان وەری گرن ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (طلب العلم فريضة على كل مسلم) رواه ابن ماجه. فێربونی زانیاری فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێ.
- نابێت فێربونی زانیاری بێ سود وەکو جادوو گەری و نجوم گرەوە.
- زانیاری وەرگرتن بەردەوامە تا موسڵمان لەژیاندابێت.

## هەڵسەنگاندن

**١** ووشەی (بەڵێ) بەرامبەر وەڵامی راستو ووشەی (نەخێر) بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ.

ئایینی ئیسلام داوای لەپەیڕەوانی کردووە کە فێری زانیاری بن چونکە هەوڵدان بۆ زانیاری:

- فەرزە.
- بەکەیفی خۆتەو سەرپشکی
- فەرمانت پێ نەکراوە.

**٢** دەستەواژەی لای راست بگەینە بە دەستەواژەی گونجاوی لای چەپ:

| | |
|---|---|
| زانیاری لەئیسلام دا | جادوگەریو نجوم گرەوە |
| موسڵمان زانیاری وەردەگرێ | بۆ هەموان |
| لەزانیاری بێ سودە | لەهەر سەرچاوەکەیەوە بێت |

**٣** ئەم رستەیە رەنگ بکە:

طلب العلم مستمر
ما دامت الحياة

## وانەی بیست و هەشتەم

# ڕێزگرتنی زانایان (تقدير العلماء)



موسڵمان تەماشای زانایان دەکات بەتەماشاکردنی ڕێزو چاودێری، چونکە زانایان چەندەها دیاری و زانیاریو خزمەت گوزاری یارمەتی دایە لەدروست کردنو پێش کەوتن دا وەکو کارەباو پزیشکو زمانەوانی، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ (ليس منا من لم يرحم صغيرنا ويعرف قدر كبيرنا)رواه الترمذي.

وەلەبەر ئەمەیە:

- لەزانایان فێری ئارامگریو ئیخلاصو خۆشەویستی بەهێز دەبین.
- دان دەنێین بە یارمەتی خودا وەهەوڵ دەدەین وەکو ئەوانمان لێ بێت.
- ڕێزی زانایان دەگرین و ئەوێ ڕۆژێ کە بە لای من تێ پەڕین.
- جێگای بۆ چۆل دەکرێتەوە ئەگەر هاتوو هاتە ناو ئەو خەڵکەی دانیشت.
- لەپشتیان دەڕۆین ئەگەر ڕۆیشتن.

وە ئەوانەی پێشینان ڕێزی زانایانی خۆیان دەگرتو وەکو خەوارزمیو رازیو ئیبن سینا.

وەئێمە لەسەر ڕێگای ئەوان دەڕۆین.

**من منالی موسڵمانم ڕێزی مامۆستایانو زانایانی ئیسلام دەگرم**

## هەڵسەنگاندن

١ ووشەی (بەڵێ) لەبەرامبەر رستەی راستو ووشەی (نەخێر) لەبەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ.

هەندێك خوورەوشت هەیە بۆ زانایانو وای لێ کردوە رێزیان بگرین

- ئارام گرتن
- ئیخلاص
- دەوڵەمەندی

٢ ئەم ووشە ناتەواوانە بە ووشەی گونجاو تەواو بکە

لەزانایان ئەوانەن کە رێزیان دەگرین

- مامۆستایان..........................و - ..............................
- .............................. - ..............................

٣ ئەم فەرمودەیە رەنگ بکە:

طلب العلم فريضة
على كل مسلم ومسلمة

## وانەی بیست و نۆیەم

### خۆشەویستی بۆ خوا ( الحب في الله )





حەسەنو صالح دوو گەنجی مزگەوت بوون، هەردووکیان نوێژیان بە کۆمەڵ دەکرد لەمزگەوت داو وە گوێ یان لەوانەی ووتاربێژی مزگەوت رادەگرت بە ناونیشانی برایەتی لەپێناو خوا وە باسی ئەو ئایەتە دەکرا کە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴿١٠﴾ ﴾الحجرات.

واتە: بڕواداران هەموویان برای یەکترن. وە حەسەنوصالحیش بڕیاریان دا ببنە برا لەپێناوی خوا یەکتریان خۆش بوێ پەیڕەوی ئەم فەرمودەی پێغەمبەریان(ﷺ) کرد کە دەفەرموێ خۆشەویستی من واجیب دەبێ بۆ کەسانێ لەپێناوی خوا یەکتریان خۆش دەوێ و هاومەجلیسو دانیشتن بن لەپێناوی خوا وە مل کەچ بن بۆ یەکتری لەپێناوی خوا ) هەروەکو دەفەرموێ (وجبت محبتي للمتحابين فيَّ وللمتجالسين فيَّ وللمتزاورين فيَّ وللمتباذلين فيَّ) رواه مالك کە دانیشتنو سەردانو خۆشەویستیو مل کەچی یەکترو بەسۆزو بەرەحم بن بۆ یەکتری لەپێناوی خوا. وە ئەو خۆشەویستیە پێویست دەکات ئەم شتانەی خوارەوەی تێدا بێت:

- سەردان کردنی یەکتری لەپێناوی خوا لەهەموو بۆنەیەك دا.
- ئامۆژگاری یەکترکردن لەکاروباری ئایینی وەکو دوورکەوتنەوەلەباسی یەکترکردن بە پاش ملەو نەمیمی.
- هاوکاری کردنی یەکتر لەسەر چاکەو خواپەرستی و لەخواترسان .
- بەخشین و ماندوبون و هەوڵ دان لەپێناوی یەکتر.

وە حەسەنو صالح نمونەیەك بون بۆهەمو گەنجانی گەڕەك کەوا لەپێناوی خوا ببون بە برا.

**من منداڵی موسڵمانم هەموو موسڵمانێکم لە پێناوی خوا خۆش دەوێ**

## هەڵسەنگاندن

**١ نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر رستەی راستو نیشانەی ( ✗ ) بەرامبەر رستەی چەوت دابنێ.**

صالحو حەسەن کۆکردنەوەی ئەم پەیوەندیە بوو لەبەر ئەوە:

- برادەری قوتابخانەبوون.
- خۆشەویستی لەپێناوی خوا.
- لەگەڵ یەك خواردنیان دەخوارد.

**٢ ووشەی گونجاو لەشوێنی گونجاو دابنێ لەم رستەیەی خوارەوە:**

| پێناوی | پە یمانیان دا | بوونە برا |
|---|---|---|

بەراستی ..........حەسەنو صالحو..........کە ببنە ..................لە............خوادا.

**٣ هەر دەستەواژەیەك لەستونی لای راست بگەینە بە دەستەواژی ستونی لای چەپ.**

| | |
|---|---|
| واجیب بوونی خۆشەویستی خوا | لەپێناوی خوا |
| صالحوحەسەن بوونە | بۆ سەردانی کردن |
| بوونە برا صالحو حەسەن | نمونەی گەنجی گەڕەك بوون |

**٣ ووشەکانی ئەم ئایەتەی قورئان رەنگ بکە:**

إنما المؤمنون إخوة



## وانەی سییەم




ئەوکاتەی موسڵمان ماڵ دەبەخشێ بە خەڵکان ئەوە بەخشندەیە وە قورئانی پیرۆز باسی ئەو کەسانەی کردوە کە ماڵ دەبەخشن بە باشە کە دەفەرموێ: ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ⑧﴾ الإنسان. واتە: خواردن دەدەن بە سنگ فراوانی بە هەژارانو بێ نەوایانو هەتیوانو دیلو دەست بەسەران. وە ماڵ سەرف کردن یەکێکە لەجۆرەکانی بەخشندەیی ئا ئەوە جێنشینی سێ یەم عوسمانی کوڕی عەففان ، کاتێ کاروانێکی گەورەی ماڵی بازرگانی لەشامەوە بۆ هاتەوە هەموی بەخشی بەسەر هەژاران. وەماڵ بەخشین بەس بەهۆی زۆر ماڵی نی یە بەڵکو ماڵ بەخشین بەو سامانەش دەبێت کە لەبەر دەستت دایەو ڕۆژانە سەرفی دەکەی بۆ ماڵو مناڵەکەت، وەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ (اتقوا النَّار ولَو بِشّقِ تَمْرةٍ، فَمَن لَمْ يَجدْ فَبَكلمةُ طَيَبة) رواه مسلم.

واتە خۆتان لەئاگری دۆزەخ بپارێزن بە لەتکە خورمایەکیش بێت وە ئەگەر هەر نە بوو با بەگفتارێکیش بێت – یان بە ووشەیەکی خۆش بێت.

یان بەخشین کە قوتابیەك پێنوسێك بدات بە قوتابیەکی هاوڕێی یان یەکێك پێڵاوی نەبێت تۆ پێڵاوی خۆتی بدەیتێ.

وەبەخشندەیی لەم کاتو ساتەدا ئەوە یە ماڵ ببەخشێ بە هەژارانو کۆمەڵەی خێرخوازیو وەبەهاناوەچوونی لێ قەوماوان ئەوانەی بێ بەرگو لیباسن یان خواردنو خواردنەوەیان نیە یان قوتابی هەژارن بە تەمای خوێندن تەواو کردن.

**من مناڵی موسڵمانم بەخشندەم خۆش دەوێت ولەگەڵیان دا دەبم**

## هەڵسەنگاندن

**١ وەڵام بدەوە بە وشەی (رازیم) یان ووشەی (نارازیم) لەمانەی خوارەوە:**

مرۆڤی بەخشندە ئەو کەسەیە ماڵ دەبەخشێ بۆ :

- دایكو باوکی
- بۆ منداڵەکانیو کچەکانی.
- بۆ کۆمەڵەی خێرخوازی.

**٢ ووشەی گونجاو بخەرە شوێنی گونجاو لەم رستەیەی خوارەوە:**

بەهاناوەچوون | خێرخوازی | بەخشینە

ماڵ بەخشین لەم کاتو ساتەدا............بۆ خەڵکانو هەژارانو کۆمەڵەی ..............وەهەروەها............بۆ ئەو کەسانەی کە جلو بەرگیان نیە.

**٣ جۆرەکانی بەخشندەیی کە موسڵمانان پێی هەڵدەستن:**

- ماڵ بەخشین.
- ..............................
- ..............................
- ..............................

**٤ ئەم ئایەتە پیرۆزە لەبەر بکە:**

﴿ وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ ﴾ الإنسان.

زنجیرەی زانیاری ئیسلامی (٤)

# خورەوشت و ئادابەکانی ئیسلام

## قۆناغی دووەم

دانراوی

مامۆستا یحیی الاقطش مامۆستا فاروق بدران

دکتۆر جمعة الخباص

وەرگێڕانی بۆ کوردی

انور قادر شێخانی

چاپی یەکەم

هەولێر

٢٠١٥ز - ١٤٣٦ك

## پێشەکی دەقە عەرەبیەکە

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد المرسلين محمد صلى الله عليه وسلم وبعد:
ئـەم پەرتوکـە پـەرتوکی دووەمـە لـەزنجیرەی زانیـاری ئیسـلامی بـۆ قۆنـاغی دووەم، وەناونیشـانەکانو بابەتـەکانی بـریتی یـە لەخورەوشـت و ئادابـەکانی و هەڵسـوکەوت لەگـەڵ خەڵکیو مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان وە گرنگـی چـاکەکردن بـۆ دراوسـێ و ئـادابی چـوونە مـاڵانو سـەردانی نـەخۆش وە هـەروەها پەیوەسـت بـونی مـرۆڤ بـە هـەلگرتنی خورەوشـتی ئیسلامی وەکو پەیمان بەجێ گەیاندنو قۆستنەوەی کاتو بەفێرۆنەدانی و هاوڕێتی پیاوچاکان و دادپەروەری و هەڵبژاردنی برادەری پـاکو چـاك وە هـەروەها چـاککردنی نێـوانی خـەڵکی وە چەندەها خورەوشتی چاکو پاك تاکو قوتابی کە لەقوتابخانە دەردەچێت بە کۆمەڵێ زانیـاریو خورەوشتی چاکەوە دەردەچێت وەدەتوانێ ببێتە سەر مەشقو پێشڕەو بۆ خەڵکانی تر.
ئەندامانی لیژنەی ئامادەکردنی ئەم پەڕاوە هەڵساون بە بەکارهێنانی زمـانی گفتو گۆ وە بـۆ ئەوەی قوتابیان زیاتر سودی لێ ببینن وە هەندێك ووشەی گرانیشی مانـای بـۆ لێکدراوەتـەوە وە هەندێك پرسیارو وەڵامـی لەگـەڵ دا هـاتوون بـۆ زیـاتر شـارەزابوون وە داوای لەبـەرکردنی هەندێك ئایەت و فەرمودە کراون وە داواکارین لەخوای گەورە ئەم پـەڕاوە لێمـان وەرگرێت وە ببێتە هاندەرێك بۆ پەیرەوی کردن بۆ کارە چاکەکان وە خوا پشـتو پـەنامان بێت والحمـد لله رب العالمین.

دانەران

# پێشەکی وەرگێڕ

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والعاقبة للمتقين والندامة للظالمين وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم أجمعين وبعد

ئازیزانم ئەم پەرتوکەی بەردەستتانە بریتی یە لەزنجیرەی دووەم لەپەرتوکی (الاخلاق والاداب) قۆناغی دووەم کە بریتی یە لەچەند ئادابو خورەوشتێك پێش کەش بە براو خوشکانی بەڕێزم بکەمو وەری گێڕم بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی بۆ ئەوەی سودی لێ وەرگرنو ببێتە مایەی دەربازبونم لەسەفەری دوورو درێژی قیامەت واخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

انور قادر شێخانی

هەولێر

٤/زى القعده/١٤٣٤ك

١٠/٩/٢٠١٣ زاینی

## وانەی یەکەم

### مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان



بیلال گوێی لەپێش نوێژی مزگەوت ئیمام بوو پاش نوێژ ئەم فەمودەی پێغەمبەری خوای دەخوێندەوە کە دەفەرموێ: (حَقُ المُسْلِمِ عَلىَ المسلم خَمْسٌ: رَدُّ السلامِ، وعَيادةَ المَرِيضِ واتِّباعُ الجَنَائِزِ وإجَابَةَ الدَّاعِي وتَشْمِيتِ العَاطِسَ) رواه البخاري ومسلم. پێشەوای مزگەوت واتای ئەم فەرمودەیەی لێکدایەوە و فەرمووی:

ماف و مامەڵەی موسڵمان لەگەڵ خەڵکی مامەڵەی چاکەیە وەلەوانەش:

- سڵاو لێ کردن لەو کەسەی بیناسی و نەیناسی پێی بڵێی : السلام عليكم ورحمه الله وبركاته.
- سەردانی کردنی نەخۆش و نزاو دوعا کردن بۆ چاك بونەوەی.
- ئەگەر برای موسڵمان پژمینی هات ووتی (الحمد لله) پێی بڵێ (يرحمكم الله) خوا رەحمت پێ بکات.
- بەدەم بانگەوازی برای موسڵمانت برۆ.
- لەگەڵ تەرمی برای موسڵمانت برۆ بۆ سەرگۆڕستان و ناشتنی.

وە بیلال سوپاسی پێشەوای مزگەوتی کرد و پەیمانی دا ئەم ئادابانە پارێزراو بکات و مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بکات وە مافیان پارێزراو بکات.

**من منداڵی موسڵمانم مامەڵە لەگەڵ خەڵکان دەکەم بە مامەڵەی چاکەو مافیان پارێزراو دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

١ سێ لەماف و واجیباتی موسڵمان لەسەر موسڵمان بنوسە:

- ..........................
- ..........................
- ..........................

٢ نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر رستەی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر رستەی چەوت دابنێ لەمانەی دادێ:

- سڵاو لەهاورێ یانم دەکەم لەگۆرەپانی قوتابخانە.
- مامەڵەی خراپ لەگەڵ کەسێك دەکەم کە مامەڵەی خراپ بێ لەگەڵ مندا.
- سەردانی نەخۆش دەکەم ئەگەر جگە لەخزمیش بێت.

٣ ئەم ووشانەی لابراون بخەرەوە شوێنی خۆیان وفەرمودەکەش لەبەر بکە:

مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان ....................وەڵامی سەلامدانەوەو سەردانی ................بەدوای تەرمی دا رۆیشتن وە وەڵامی ..................و وەڵامی پژمینی بدەینەوە.

٤ ئەم قسەی نەستەقە بخوێنەوەو لەبەری بکە:

مامەڵەی خەڵکی وابکە کە چۆن پێت خۆشە مامەڵەت لەگەڵ بکەن.

## وانەی دووەم

# ئادابی مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکان



بیلال گەڕایەوە ماڵەوە و ئەم بابەتەی کە گوێ بیستی بوو لەمامۆستای مزگەوت بۆ باوکی گێڕایەوە لەپاشان ووتی ئەی باوکە جگە لەم ئادابە زیاتر هەیە کە موسڵمان پارێزگاری لێ بکات و پەیڕەوی بکات لەگەڵ خەڵکی دا.

باوك:بەڵێ ئەی کوڕی خۆم، خوا پایەدارت بکات ئەمانە هەندێکیانە:

- نەرمو نیانی لەگەڵ خەڵکی دا، ئەویش بە یارمەتی دانی بێ هێزان وڕێز گرتن لەگەوران و بەزەیی هاتن بە بچوکان.
- چاکە کردن لەگەڵ خەڵکان ئەویش بە تەوقەکردنو قسەی نەرمو نیانی.
- چاوپۆشی لەمامەڵە کردن وە موسڵمان نەرمو چاوپۆشە ئەگەر شت بفرۆشێ وئەگەر بکڕێ.
- پارێزگاری کردن لەماف خەڵکیو ماڵو سامانیان وە ماڵ بە فیڕۆ دان حەرام و قەدەغەیە.
- عوزرو بەهانە هێنانەوە لەکاتی هەڵەو سەهوداو وە چاوپۆشی لەهەڵەی خەڵکی کردن.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (أَكْمَلُ الْمُؤمنينِ إيمانا أَحْسَنُهُم خُلُقا) رواه الترمذي.

تەواوترین بڕوادار ئیمانو بڕوای ئەو کەسەیە خوورەوشتی جوان بێت.

**من منالی موسڵمانم لەگەڵ خەڵکان بە جوانترین شێوە هەڵسو کەوت دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

١ چی دەکەی لەم هەڵوێستانەی خوارەوە:

- دیتم لەشوێنی نانەوا قەرەباڵغی کە خەڵك نان دەکڕێ

.....................................................................

- لەگۆڕەپانی قوتابخانە جانتایەك پارەم دیتەوە

.....................................................................

- دوو کەس لەرێگا خۆیان لێکدا بە سەهو

.....................................................................

٢ لەنەرمو نیانی وبەزەیی بە بچوکان دوو نمونە بنوسەوە:

- ..........................................................
- ..........................................................

٣ چۆن موسڵمان لەکڕین وفرۆشتن نەرمو چاوپۆشە!

.....................................................................

.....................................................................

٤ ئەم فەرمودەیە رەنگ بکەو لەپاشان لەبەری بکە:

أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَاناً أَحْسَنُهُمْ خُلُقاً

## وانەی سێ یەم

### چاکە کردن لەگەڵ دراوسێدا



خانەوادەی جیهاد خانەوادەیەکی بەڕێز بوون و ڕێزی دراوسێ یان دەگرت وە مامەڵەی چاکیان دەکرد وە لەنمونەی مامەڵە کردن لەگەڵ دراوسێ:

- پارێزگاری لەدراوسێ بکە و ئازارو ئەزیەتیان مەدەن چ بە گفت و گۆ چ بە کردەوە.
- پیرۆزبایی لەدراوسێ بکە بە هۆی بۆنەکانی خۆشی ، پێی بڵێ پیرۆزت بێت .
- ڕێزی دراوسێ بگرەو خواردنی بۆبنێرە.
- سەرەخۆشی لێ بکە کاتێ توشی نارەحەتیەك وموسیبەتێك دەبێت وەهەوڵ بدە خەمو خەفەتی لەسەر سوك بکەی پێی بڵێ: خوای گەورە پاداشتت بداتەوە .
- عەیب و نەنگی دراوسێ داپۆشە.
- یارمەتی دراوسێ بدە لەکاتی پێویستی.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی:( مَنْ كانَ يُؤْمن باللهَ واليَوْم الآخِرِ فَلْيُحسِنُ إلى جارة) رواه مسلم. کەسێ بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێت با لەگەڵ دراوسێی چاك بێت.

**من منداڵی موسڵمانم چاکەو یارمەتی دراوسێ دەدەم**

## هەڵسەنگاندن

**١ ووشە لادراوەکان بنوسەوە لەم بۆشاییانەی خوارەوە:**

- یارمەتی دراوسێ دەدەم لەکەیفو خۆشیەکانی وەپیرۆزبایی لێ دەکەم و دەڵێم:

....................................................

- یارمەتی دراوسێ دەدەم لەناخۆشیەکانی وە دەڵێم:

....................................................

**٢ مافی دراوسێ لەسەرت:**

- یارمەتی دان.

....................................................

- ئەگەر عەیبێکم لێ دیت ..........................

**٣ چ دەکەی لەم هەڵوێستانەی خوارەوە:**

- ئەگەر ماڵەوەت خواردنێکی خۆشیان ئامادەکردبوو تۆش دراوسێت هەبوو چ دەکەی.
- ئەگەر کوڕی دراوسێ یەك هەڵەیەکی بەرامبەرت کرد تۆ چی دەکەی؟
- ئەگەر هەڵەیەکت بەرامبەر دراوسێ یەکت ئەنجام دا چی دەکەی؟

**٤ ئەم ووشانە بکە بە رستەیەکی گونجاو کە فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) لەپاشان لەبەری بکە:**

(من کان، والیوم، یؤمن باللە، الآخر، جارە، فلیحسن إلی)

## وانەی چوارەم

### دراوسیێ پێش خانوو کڕین (الجار قبلِ الدار)



عەبدوڵلای کوڕی موبارەك پیاوێکی چاکەکار بوو چاکەی لەگەل دراوسێی دەکرد، ڕۆژێکیان دراوسیێ یەکەی ویستی خانوەکەی خۆی بفرۆشیێ بۆ ئەوەی قەرزی لەسەر بوو بیداتەوە.

بازرگانەکە وتی: خانوەکەی بە چەند دەفرۆشێت؟

فەرمووی: بە دوو هەزار دیناری زێڕ

ووتیان: ئەم خانووە هەزار دیناریش ناکات.

ووتی: ڕاست دەکەن بەڵام هەزار بۆ نرخی خانووەکە وهەزاریش بۆ نرخی دراوسیێ یەکە.

کە عەبدوڵلای کوڕی موبارەك گوێی لەم وتەیە بوو بانگی کردو هەزار دیناری پیێ بەخشی پێی ووت ئەم خانوەت مەفرۆشە.

لەم چیرۆکە ئەمانە فێر دەبین:

- هەڵبژاردنی دراوسێی چاك و پارێزگاری لێی.
- گرنگی دراوسیێو بەجیێ گەیاندنی مافی دراوسیێ.
- چاکەکردن بۆ دراوسیێ ویارمەتی دانی لەکاتی پێویست.

**من منالی موسلمانم ڕێزی دراوسیێ دەگرمو مافیان پارێزراو دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

١ باسی چیرۆکی عەبدوللای کوڕی موبارەك بکە لەگەڵ دراوسێ یەکەی.

٢ لەچیرۆکی عەبدوللای کوڕی موبارەك فێری ئەوە دەبین لەگەڵ دراوسێ دا:

- چاکەکردن لەگەل دراوسێ.
- ..................................
- ..................................

٣ چی دەکەیت ئەگەر تۆ دراوسێی ئەم پیاوە هەژارە بوویت؟

..................................

..................................

٤ مانای چی یە دراوسێ پێش خانوو؟

..................................

..................................

٥ چۆن پێت خۆشە دراوسێت وا بێت؟

..................................

..................................

٦ باسی هەڵوێستەك بکە کە یارمەتی دراوسێ یەکەت داوە.

## وانەی پێنجەم

# ئادابەکانی مۆڵەت وەرگرتن بۆ سەردان کردن



زیاد لەگەڵ باوکی سەردانی ماڵی مامی کرد.

باوك: ئەی کوڕی شیرینم پێویستە پارێزگاری لەئادابی سەردان بکەی.

زیاد: ئادابەکانی مۆڵەت وەرگرتن چی یە ئەی باوکە؟

باوك: ئادابەکانی مۆڵەتی چوون بۆ ماڵان زۆرن، لەوانە:

- لەلای تەنیشت دەرگا دەوەستی هەتا ئەوانەی لەژوورەوەن نەیان بینی.
- مۆڵەتی چوونە ژوورەوە وەرگرەو ناوی خۆت بدە.

زیاد: ئایا سڵاو کردن لەئادابی مۆڵەت وەرگرتنە ئەی باوکە؟

باوك: بەڵێ ئەی کوڕی خۆم سڵاو دەکەیتو دەڵێی(السلام علیکم )ئایا بێمە ژوورەوە یان نەء؟

زیاد: وە ئەگەر خاوەن ماڵ مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی نەدای؟

باوك: دەبێ بگەڕێیەوە ئەی کوڕەکەم بێ توڕەبون ئەگەر مۆڵەتیان نەدای یان کەسی تیا نەبوو.

زیاد: سوپاست دەکەم باوکە لەسەر ئەو وانەی پێت دام منیش پارێزگاری لەئادابەکانی چوونە ژوورەوە دەکەم لەهەموو سەرادنێك دا.

**من منداڵی موسڵمانم پارێزگاری لەئادابی مۆڵەت دەکەم لەکاتی سەردانی کردن**

## هەڵسەنگاندن

١ چی دەکەیت لەم هەڵوێستانەی خوارەوە:

- ئەگەر خاوەن ماڵ بەو کەسەیان وت کە هاتوو بۆ ماڵیان تۆ کێیت؟

..........................................

- ئەگەر خاوەن مال داوای گەڕانەوەی لێ کردی.

..........................................

٢ رات چی یە دەربارەی:

- کەسێ بانگی خاوەن ماڵ بکات بە دەنگی بەرز

..........................................

- خاوەن ئۆتۆمبێلەکە هۆڕنی سەیارە بە کاربهێنێ لەجیاتی زەنگ

..........................................

٣ ئایا سلاو لەماڵەوەت دەکەیت کە چوویتە ماڵەوە؟ وە بۆچی؟

..........................................

..........................................

..........................................

٤ نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر دەستەواژەی راستو نیشانەی ( ✗ ) بەرامبەر دەستەواژەی چەوت دابنێ.

- ئەوەی دەچێتە سەردان لەتەنیشت دەرگا دەوەستێ.
- ئەوەی دەچێتە سەردان ناوی خۆی دەڵێو کاتێ داوای ناوی کرا.
- ئەوەی دەچێتە سەردان دەچێتە ماڵێك کەسی تیا نەبێت.
- دەڵێ (السلام علیکم) سلاو لەخاوەن ماڵ.

## وانەی شەشەم

### ئادابی بەکارهێنانی تەلەفۆن



دایك منالەکانی فێری ئادابی بە کارهێنانی تەلەفۆن دەکردو ووتی:

- لەسەرەتادا بەسەلام دەست پێ دەکەین‌و دەڵێین (السلام علیکم).
- زۆر قسە ناکەین لەتەلەفۆن کردن دا.
- ناهێڵین منال گەمەو گاڵتە بە ئامێری تەلەفۆن بکات.

یەك لەمناڵەکان ووتی ئەی دایکە منالێك دەناسم بەتەلەفۆن خەڵك بێزار دەکات وە پەیوەندیان پێوە دەکات بەبێ پێویستی .

دایك: نەخێر ئەی کورەکانم تەلەفۆن بۆ بێزارکردنی خەڵك‌و ئازار دانی خەڵك دروست نەکراوە.

کچەکە: پێویستە لەکورتی ببرێتەوە قسەکردن لەتەلەفۆن،نابێت زۆر قسەی پێ بکەین‌و چیرۆکی پێ بهۆنینەوە.

دایك: باشت ووت وەلەئادابەکانی قسەکردن بە تەلەفۆن ئەوەیە کە قسەیان لەگەڵ کردین دەبێ گوێی بۆ راگرین تا تێ بگەین کەچی دەوێت وە ئاگاداری بکەین بە کۆتایی گفت‌و گۆکە پێش داخستنی تەلەفۆنەکە.

منالەکان: سوپاس ئەی دایکە لەمەولا پارێزگاری لەئادابەکانی دەکەین.

**من منالی موسلمانم پارێزگاری لەئادابی بەکارهێنانی تەلەفۆن دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

**١ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:**

- ئەو دەستەواژەیە چی یە پێویستە لەکاتی بەکارهێنانی تەلەفۆن پەیرەو بکەین.

..........................................................

- ئەگەر ویستت کۆتایی بە تەلەفۆن بهێنی چی دەڵێیت بە هاوڕێکەت؟

..........................................................

- ئەگەر منداڵێکت دیت گەمەو گاڵتەی بە تەلەفۆن دەکرد چی دەکەی؟

**٢ نیشانەی(✓)بەرامبەر وەڵامی راست و نیشانەی(✗)بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ.**

- تەلەفۆن بەکاردێت بۆ گەمەو کات بەسەربردن.
- گوێ لەبەرامبەرم رادەگرم لەکاتی تەلەفۆن‌و قسەی پێ نابڕم.
- واز لەمنداڵان دێنم کە گەمەو گاڵتە بە تەلەفۆن بکەن.
- تەلەفۆن دەکەین لەگەڵ دراوسێمان تا لەهەواڵی لەش ساغی نەخۆشیان بپرسین.

**٣ بنوسە:**

- بەکارهێنانی تەلەفۆن بە جوانی کە هەڵدەستێ بە

..........................................................

- بەکارهێنانی تەلەفۆن بە هەڵە و تۆش ئاگاداری چی دەکەی

..........................................................

# وانەی حەوتەم

## بەهەڵ زانینی کات



ئایینی ئیسلام گرنگی داوە بە هەڵقۆستنەوەی کات و سود لێ وەرگرتنی ولەوانەش:

- موسڵمان بەیانیان زوو هەڵدەستێ لەخەو نوێژی بەیانی دەکات و خۆی ئامادە دەکات بۆ چوونی بۆ سەرکار.
- لەدەسپێکی رۆژدا بە زیکری خواو یادی خوا دەست پێ دەکات و وەکۆتایی دێنێ بە یادی خوا.
- کاتی خۆی تەرخان دەکات بۆ ئیسراحەت و، کاتێکی بۆ کارکردن.
- ژیانی خۆی تەرخان دەکات بۆ کردەوەی چاکە پێش مردنی.
- وەسود لەلەش ساغی دەبینی پێش نەخۆشی.
- بۆشایی کاتی پڕ دەکاتەوە پێش ئەوەی توشی سەرقاڵی ببێت .
- سود لەگەنجی دەبینێ پێش پیربونی.
- ماڵ دەبەخشێ بەسەر هەژاران کە دەوڵەمەندی پێش ئەوەی هەژاری.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

(اغتنم خَمسا قَبْل خَمس: حيَاتُك قَبل مماتك، وصحتك قَبْل سَقْمكَ، وفراغَكَ قبل شُغلك، وشبابَك قَبلَ هَرمكَ، وغنَاكَ قبلَ فَقَرْك) رواه الحاكم.

((پێنج شت بە هەڵ بزانە پێش هاتنی پێنج شت: ژیانت پێش مردنت، وەلەش ساغیت پێش نەخۆشی، وە بێ ئیشیت پێش سەرقاڵیت، وەگەنجی پێش پیربوون، وەدەوڵەمەندی پێش هەژاربونت).

**من منداڵی موسڵمانم کاتی خۆم بە فیڕۆ نادەم تەنها لەکردەوەی چاك بەکاری دێنم**

## هەڵسەنگاندن

١ ئایا دەزانی:

- سَقَمِكَ: نەخۆشی یەکەت
- هرمكَ: پیری یەکەت

٢ موسڵمان سەر لەبەیانی دەست بە چی دەکات و بەچیش کۆتایی دێنێ.

٣ رستەی ستونی یەکەم بگەینە بەرستەی گونجاوی ستونی دووەم لەمانەی خوارەوە:

پێنج شت بە هەڵ بزانە پێش پێنج شت:

| | |
|---|---|
| ژیانت پێش | هەژاریت |
| لەش ساغیت پێش | پیریت |
| بێ ئیش و فەراغی | مردن |
| گەنجی پێش | سەرقاڵی بوون |
| دەوڵەمەندی پێش | نەخۆشی |

٤ کاتو ساتی خۆم رێك دەخەم هەموو رۆژێك بە گوێرەی خشتە:

| کاتژمێر | کار |
|---|---|
| ٦–٧ بەیانی | |
| ٧–٨ بەیانی | |
| ٨–١ نیوەڕۆ | |
| ١–٢ نیوەڕۆ | |
| ٢–٤ عەسر | |
| ٤–٧ ئێوارە | |

# وانەی هەشتەم

## هاوکاری (التعاون)



مامۆستا هاتە ژوورێ بۆ پۆل بە قوتابیانی گوت: لەپشت قوتابخانە گۆڕەپانێکی فراوان هەیە لەبەیانیەوە هەڵدەستین بە پاککردنەوەو ئامادەکردنیو دارچاندنو نەمام ناشتن تا ببێتە باخچەیەکی ڕێكو پێكو جوان.

مەحمودی قوتابی وەستاو وتی: ئێمە منالان منالین چیمان پێ دەکرێ بکەین؟

مامۆستا لەوەڵامدا ووتی: بەڵێ ئەی مەحمود هەر کۆمەڵێك هەڵدەستێ بە کارێکی دیاری کراو وە بەهاوکاریو هەرەوەزی دەتوانین باخچەیەکی جوانیکلە بنیات بنێین.

وەلەرۆژی دواتر مامۆستا قوتابیانی دابەش کردو بۆ هەر کۆمەڵی کارێکی بۆ دیاری کردن. کۆمەڵێ هەڵسن بە پاککردنەوەی وەکۆمەڵێك هەڵسن بەچاڵ هەڵکەندن وەکۆمەڵی سێ یەم داریچێنن وەکۆمەڵی چوارەم ئاودانی بکەن و ئاو بێنن وەهەر کۆمەڵێ هەڵسا بە کاری دیاری خۆی وەلەکۆتایی هەمان رۆژدا هەموو قوتابیان بە دەنگی بەرز وتیان بە هاوکاری و هەرەوەزی کارێکی گەورە ئەنجام دەدەین سودی بۆ گشت لایەك دەبێت.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ ﴿٢﴾﴾ المائدة. واتە: یارمەتیو هاوکاری یەکتر بدەن لەسەر چاکەو لەخواترسان وەیارمەتیو هاوکاری یەکتر مەکەن لەسەر خراپەو دوژمنداری.

**من منالی موسڵمانم هاوکاری لەگەڵ برادەرانم دەکەم بۆ کاری چاك**

## هەڵسەنگاندن

**١ ئایا دەزانی:**

- البر: فەرمانبەرێتی خوای گەورەیەو (چاکە).
- الاثم: کردەوەی خراپە.
- التقوی: کردەوەی کە خوا پێی رازی بێت

**٢ نیشانەی راست (✓) لەژێر ئەم کردەوەیەی کە چاکەو نیشانەی (✗) لەژێر کردەوەی ناراست دابنێ لەم وێنانەی خوارەوە:**









**٣ دەربارەی هەرەوەزیو هاوکاری باسی نمونەیەك بکە.**

..........................................

**٤ ئەم ئایەتە رەنگ بکەو لەپاشان لەبەری بکە:**

وتعاونوا على البر والتقوى
ولا تعاونوا على الإثم والعدوان

# وانەی نۆیەم

## بەجێ گەیاندنی پەیمان و بەڵێن دان



ئایینی ئیسلام فەرمانی کردووە بەراست گۆیی، وەلەجۆرەکانی راستگۆیی بەجێ گەیاندنی پەیمان، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْئُولًا ﴿٣٤﴾ ﴾ الإسراء.
واتە:وەفا بکەن بە بەڵێنو پەیمانەکانتان چونکە خاوەن بەڵێنو پەیمان لێپرسراوە بەرامبەر بەڵێنەکانی. وەموسڵمان لەوکاتەی پەیمانی دا بۆ هەر کەسێك پێویستە جێ بەجێی بکات وە نابێت پاشگەز بێتەوە لێی تا جێ بەجێی نەکات وە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ ﴾ الصف.
ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بۆچی ئەوەی دەڵێن ئەنجامی نادەن زۆر مایەی رقو تورەیی یە لەلای خوا کە قسەیەك دەکەن کردەوەی پێ ناکەن. وە بەجێ نەگەیاندنی عەهدو پەیمان لەنیشانەکانی مونافیقو دووڕووەکانە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمەی ترساندووە لێی کە دەفەرموێ: (آية المنافق ثلاث : إذا حدّث كَذَبَ، وإذا وَعَد اخْلف، وإذا أُؤْتُمِنَ خَانَ) متفق عليه.
واتە: نیشانەی مونافیقان سێ شتە کە قسەی کرد درۆی کرد کە وەعدو پەیمانی دا نەی باتە سەر وە کە ئەمانەتو سپاردەی لا دانرا خیانەتی تێدا بکات.
موسڵمان دەبێ پارێزگاری لەپەیمان و بەجێ گەیاندنی بکات.

**من منالی موسڵمانم پارێزگاری لە پەیمان دەکەمو جی بەجێ دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

١ موديك:

خودای گەورە باسو مەدحو ستايشی گەورەمان ئيسماعيل سەلامی خوای لێ بێت دەكات كە پەيمانو وەعدی جێ بەجێ كردووە كە دەفەرموێ: ﴿ وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَبِيًّا ﴿٥٤﴾ ﴾مريم. واتە: لەقورئاندا باسی ئيسماعيل بكە بێگومان ئەو لەپەيمانو بەڵێنەكانی دا راست گۆبوو ئەو نێردراوو پێغەمبەری خوا بوو.

٢ ئەگەر موسڵمان وەعدی پێ درا چی بكات

..........................................................

٣ لەنمونەی بەجێ گەياندنی پەيمان

- پەيمانم دا بەبرادەرێكم كە چيرۆكێكی بۆ باس بكەم بەيانی لەماڵەوە
- ..........................................................
- ..........................................................
- ..........................................................

٤ ئەم فەرمودەيەی پێغەمبەر (ﷺ) تەواو بكە:

آية المنافق ثلاث..............................

## وانەی دەیەم

### هاوڕێیەتی پیاو چاکان



باوکی یوسف لەگەڵ منداڵەکانی دانیشت لەماڵەوە لەپاش نوێژی مەغریب وە ووتی ئەی منداڵەکانم، هەر یەکێك لەئێمە پێویستی بەوە هەیە کە برادەرێکی هەبێت، وەبرادەرایەتیش دەورێکی کاریگەری هەیە لەسەر خوڕەوشتی برادەرەکەی تر، بۆیە پێویستە لەسەرمان برادەری باشو چاك هەڵبژێرین وەپێغەمبەرمان فەرمانی کردووە کە دەبێ برادەرایەتیو هاوڕێ یەتی چاکان بکەین. کە دەفەرموێ (لا تُصَاحِبْ إلا مُؤْمِناً)، وە هاوڕێیتی پیاوچاکیش دەبێ ئەم سیفەتانەی لێ بێتە جێ لەوانەش: یەکەم:پارێزگاری کردن لەسەر نوێژ کردن.
دووەم: لەگفتو گۆدا راستگۆ بێتو درۆی نەکات، سێ یەم:هەڵسو کەوتی باش بێت لەگەڵ برادەرەکانی وەکەس ئازار نەدات وە بەخوڕەوشتی باش هەڵسو کەوت بکات.
ئاگاداربن ئەی کوڕەکانم بۆ ئەم سیفەتە باشانە لەوکاتەی هاوڕێیەتی هەڵدەبژێرن چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (المرءُ على دينِ خَليلِه فَلْيَنْظُرْأَحَدُكُمْ منْ يخالِلْ) أخرجه أبو داود.
واتە: مرۆڤ لەسەر ئایینی برادەرەکەیەتی با هەر یەکێکتان تەماشای ئەوە بکات کێ دەکاتە هاوڕێی خۆی. وە مانای وایە کە چاكو پاك هاوڕێی چاكو پاك دەکات. منداڵەکان ووتیان: ئێمە گرنگی دەدەین بەم سیفەتانە لەکاتی هەڵبژاردنی هاوڕێیەتی إن شاءالله ئەی باوکە.

**من منداڵی موسڵمانم هاوڕێی پیاوچاکان دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

### ١ ئایا دەزانی:

خلیله: هاوەڵی یان برادەری

من یخالل: ئەو کەسەی کە هاوڕێتی دەکەی

### ٢ سێ سیفەت باس بکە کە لەکاتی هەڵبژاردنی هاوڕێتی پێویستت پێ یەتی:

- ..........................................
- ..........................................
- ..........................................

### ٣ ئەو ووشانەی گونجاو بخەرە شوێنی گونجاوی خۆی لەم رستانەی خوارەوە:

| مؤمناً | چاك دەبن | ڕاستگۆی |
|---|---|---|

- لەسەرمان پێویستە کە ........................ بین لە هەڵبژاردنی هاوڕێتی.
- هاوڕێتی چاك دەبێت ..............................
- لا تصاحب إلا............................

### ٤ ئەم فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) تەواو بکە:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

(المرء علی دین ..........................فلینظر أحدكم.....................)

## وانەی یانزەهەم

### مافی هاوڕێیەتی



لەرۆژی دواتر باوکی یوسف پرسیاری لەکوڕەکانی کرد دەربارەی هاوڕێیەکانیان وە هەر یەکێکیان ناوی هاوڕێیەکی خۆی هێنا لەبرادەرە چاکەکان لەپاشان باوکی پێ یانی ووت: ئێستا ئەی کوڕەکانم هەتا ئەم هاوڕێیەتیە بەردەوام بێت لەسەر هەر یەکێکتان پێویستە پارێزگاری لەمافی هاوڕێیەتی بکات وەلەگرنگترینیان ئەمانەن:

- لەنێوان چەند کاتێك دادەبێ سەردانی هاوڕێکەت بکەی.
- هەڵسێ بە ئامۆژگاری کردنی کاتێ تووشی هەڵەیەك هات.
- یارمەتی بدات لەکاتێ پێویستی پێت بوو چونکە هاوڕێیەتی لەکاتی تەنگاویو ناخۆشی دیار دەکەوێ.
- چاوپۆشی لێ بکات کاتێ کە هەڵەی بەرامبەرت کرد.
- یارمەتیو هاوکاری بێت لەخۆشیەکانی وناخۆشیەکانی.
- لەپاش ملە پارێزگاری بکات وەلەلای خەڵکی نەی شکێنێت.
- بەرگری لێ بکات لەکاتێ کە دیار نەبوو.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ٦٧﴾ الزخرف.
هاوڕێو برادەران لەرۆژی دوایی هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان دەبنە دوژمن تەنها پارێزگاران نەبێت.

**من منالی موسلمانم پارێزگاری لەمافی هاوڕێیان دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

**١ ئایا دەزانی؟**

- الاخلاء: برادەران و هاوڕێیان

**٢ لەمافی هاوڕێیان کە دەبێ پارێزگاری لێ بکەم:**

- ..............................
- ..............................
- ..............................
- ..............................

**٣ هەر رستەیەك بگەینە بە وێنەی گونجاو لەمانەی خوارەوە:**



- هاوڕێ ئامۆژگاری هاوڕێی دەکات کە نابێت گەمەو گاڵتـە بە شتی پیس بکات لەرێگادا.



- هاوڕێ هاوکاری هاڕێیەکەی دەکات لەخۆشی دا.



- هاوڕێ ئامۆژگاری هاوڕێیەکەی دەکات کە هەڵسو کەوت و مامەڵە بە خراپە لەگەڵ خەڵکی نەکات.

**٤ من تێدەگەم فەرمانی خوا کە دەفەرموێ :**

﴿ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾الزخرف.

## وانەی دوانزەهەم

### ئادابەکانی ڕێگاوبان ( اداب الطريق ) بەشی یەکەم



بۆ ڕێگاوبانی گشتی لەئاییني ئیسلام دا چەند ئادابێکی بۆ دانراوە وە من منداڵی موسڵمانم پارێزگاری ئەو ئادابانە دەکەم ، لەوانەش:

- لەسەر شۆستەکان دادەڕۆم کە تایبەتە بە هاتوچۆی خەڵکی.
- نزیك ناکەومەوە لەشەقام و لێواری شەقام.
- لەشوێنی دیاری کراوی شەقامەکان دەپەڕمەوە.
- پەیڕەوی نیشانەکانی هاتو چۆ دەکەم.
- لەڕێگادا دەڕۆم بە هێمنیو لەسەرخۆیی ، یاریو گەمەو غاردان لەسەر شۆستە ناکەم.
- پارێزگاری لەئۆتۆمبێلەکانی کە لەلێواری شەقام وەستاون دەکەمو نابمە ئازارو ئەزیەت بۆیان.
- خۆم بە ئۆتۆمبێڵ هەڵناواسم لەکاتی ڕۆیشتنی چونکە مەترسی خراپی لێ دەکەوێتەوە.

من منالی موسڵمانم پەیڕەوی بە نیشانەکانی هاتوو چۆ دەکەمو پارێزگاری لەئادابەکانی ڕێگاو بان دەکەم

## هەڵسەنگاندن

**١ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:**

○ لەچ شوێنێکی شەقام دەپەڕیتەوە؟

.........................................

○ بۆچی لەسەر لێواری شەقام ناڕۆیت؟

.........................................

**٢ نیشانەی (✓) بەرامبەر خوڕەوشتی چاكو نیشانەی (×) بەرامبەر خوڕەوشتی ناراست دابنێ.**

○ قوتابی ڕێگا دەبڕێ بۆ پەڕینەوە کاتێ دەبینێ نیشانەی هاتوچۆی ڕێبواران سەوزە.

○ قوتابی خۆی بە ئۆتۆمبێلێ هەڵدەوسێ.

○ قوتابی غاردەدات لەسەر شۆستەکاندا وە لەگەڵ خەڵکان بەریەك دەکەون.

**٣ چی دەکەین کاتێ نیشانەی هاتوچۆی ڕێبواران دەبینین(پیادە)؟**

○ سور.............................

○ زەرد.............................

○ سەوز.............................



# وانەی سیانزەم

## ئادابەکانی ڕێگاوبان ( بەشی دووەم )





لەئادابەکانی ڕێگاوبان کە دەبێ پارێزگاری بکەین ئەمانەن:

- زبڵو خۆڵو خاشاك بکەینە ناو ئەو سەبەتەی کە بۆی تەرخان کراوە نابێ لەسەر شەقام فڕێ بدرێت.
- دڕكو داڵ لەسەر ڕێگا لابدەم چونکە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمویەتی :
  (وتُمِيطُ الأذَىَ عنِ الطّريقِ صَدَقَةٌ) متفق علیه.
- پارێزگاری لەو دارو گوڵانە دەکەین کە چاندراون لەلێواری شەقام دان نابێت بیان بڕین یان بیان شکێنیت.
- گەمەو یاری لەو شوێنەی تایبەتە بۆ یاری دەکەمو لەسەر شەقام یاری ناکەم.

**من منداڵی موسڵمانم شتی بە ئازار لەسەر ڕێگا لادەبەم**

## هەڵسەنگاندن

**١ ئایا دەزانی:**

- النفایات: پاشماوەی شتی بەکارهاتوو
- تمیط: لابردن
- الأذی: هەر شتێ کە ئازاری خەڵك بدات.

**٢ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:**

- شتی پاشماوەی زبڵ لەکوێ دادەنێی؟

....................................................

- لە چ شوێنێ یاری تۆپێن دەکەی؟

....................................................

**٣ نیشانەی ( ✓ ) لەژێر خورەوشتی چاكو نیشانەی (✗) بەرامبەر خورەوشتی ناراست دابنێ لەژێر ئەم وێنانەی خوارەوە:**









**٤ ...ن ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر دەکەم کە دەفەرموێ:**

(وتمیط الأذی عن الطریق صدقة)

## وانەی چواردەهەم

### ئادابی گفتوگۆ ( بەشی یەکەم )



مامۆستا پرسیاری لەقوتابیانی کرد، وە قوتابیانیش بە شێوەی کۆمەڵ وەڵامیان دایەوەو بێ داوای مۆڵەت کردن وەمامۆستاکەیان داوای لێ کردن کە دەبێ پەیرەوی ئادابی قسەکردن بکەن و ووتی لەو کاتەی منالی موسڵمان قسە دەکات دەبێ پەیرەوی لەئادابی گفتو گۆ بکات. لەم کاتەدا قوتابیەك هەستاو ووتی ئادابی گفتوگۆ چی یە ئەی مامۆستا؟

مامۆستاش ووتی ئادابەکان ئەمانەی خوارەوەن:

- داوای مۆڵەت دەکەین پێش قسە کردن.
- خۆت دووربگرە لەقسەی بێ هودە وکات بەسەربردن.
- باسی ئەو شتە بکە کە زانیاریت دەربارەی هەیە وە ئەوەی پەیوەندی بە تۆوە نی یە باسی لێوە مەکە.
- راستگۆبیت لەقسە کردنو هەرگیز حەق بێژبەو درۆ مەکە.

چونکە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەفەرموێ: (إنّ الصّدْقَ يَهدْي إلى البّر وَإنّ البِرّ يهدْي إلى الجَنّة وإنّ الرجّلُ ليُصَدِقُ حَتّى يكْتُبُ عنْد الله صدّيقاً) رواه البخاري ومسلم.

واتە: راستگۆیی بەرەو چاکە رێگە دەبرێ وەچاکەش بەرەو بەهەشت دەچێت وە بەردەوام مرۆڤ چاکەو راستگۆ دەبێت تا وای لێ دێت لەلای خوا بەراستگۆ لەقەلەم دەدرێ.

یەك لەقوتابیان ووتی: سوپاس ئەی مامۆستا گیان وە ئێمە لەمەودوا پەیرەوی لەئادابی گفتو گۆ دەکەین.

**من منالی موسڵمانم داوای مۆڵەتی گفتو گۆ دەکەم وە پەیرەوی لەراستگۆیی دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

**١** ئایا دەزانی :

- یهدی : دەگەیتە
- البر: چاکەو کردەوەی چاك
- اللغو: قسەی بێ سەروبەرو بێ سود

**٢** وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەرەوە:

- چی دەکەی کاتێ ویستت قسە بۆ خەڵکان بکەیت؟

........................................................

- مزگێنی چی داوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە کەسێ پارێزگاری لەراستگۆیی بکات.

........................................................

........................................................

**٣** موسڵمان پەیڕەوی‌و پارێزگاری لەئادابی قسەکردن دەکات وەلەوانەش:

- دوورکەوتنەوە لەقسەی بێ هودە.
- ........................................................
- ........................................................

**٤** پێنوس بەسەر وشەکانی ئەم فەرمودەیە دابێنەو لەپاشان لەبەری بکە:

( إن الصدق يهدي إلى البر وإن البر يهدي إلى الجنة وإن الرجل ليصدق حتى يكتب عند الله صديقاً )

## وانەی پانزەهەم

### ئادابی گفتوگۆ (بەشی دووەم)



قوتابیەك ووتی: هەندێك ئادابی تر هەیە ئەی مامۆستا .

مامۆستا: بەڵێ ئەی کورەکانم لەئادابی گفت و گۆ لەوانەش:

- موسڵمان دەبێ جوان گوێ رابگرێ لەبەرامبەری کاتێ قسە دەکات و نابێ خۆی بە شتی ترەوە سەرقاڵ بکات.
- ئەو قسەیە دەکات کە گونجاوە بەو دانیشتنە وە نابێ زۆر بلێ بێت وە ئامارژە بێت بۆباسی پاش ملە بۆ کەسێك بێت.
- رێز لەگەوران بگرێت وە کات بەو کەسانەش بدات کە قسە بکەن.
- بوار بەو کەسانەش بداو نابێ قسەیان پێ ببڕی بەڵکو چاوەڕێ بکە تا قسەیان تەواو دەبێت.
- بە هێمنی قسە بکەو دەنگ بەرز مەکەرەوە تەنها گەر خەڵکان لێت تێ نەگەن.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ١٩﴾ لقمان.

واتە: دەنگ نزم کەرەوە چونکە ناخۆشترین دەنگ دەنگی گوێ درێژە. قوتابیەکە سوپاسی مامۆستای کرد و بەڵێنی داکە خۆی و هاورێکانی پەیرەوی ئەم ئادابانە بکەن.

**من منالی موسڵمانم گوێ لەخەڵك رادەگرم کە قسە بکەن و پەیرەوی ئادابی قسەکردن دەبم**

## هەڵسەنگاندن

### ١ ئایا دەزانی:

- اغضض: دەنگت نزم کەرەوە
- انکر: خراپترین، ناخۆشترین.

### ٢ لەم دوو هەڵوێستە چی دەکەیت؟

- کەسێ لەتۆ بەتەمەن تر بوو ویستی قسە بکات.

........................................

........................................

- لەکاتی پشودا هاورێم ویستی گفتوگۆم لەگەڵ بکات.

........................................

........................................

### ٣ نیشانەی (✓) بەرامبەر رستەی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر رستەی چەوت دابنێ.

- گوێ لەو کەسە دەگرم کە قسە دەکات ، واز لەم شتە دێنم کە تا ئەو بێ دەنگ بێت.
- ئەگەر هاورێم هەڵەی کرد لەگفتوگۆ قسەی پێ دەبڕم.
- بە هێمنی قسە دەکەم بە قەد پێویستی گوێ گر.
- خوای گەورە نەهیو قەدەغەی کردووە لەدەنگ بەرزکردنەوە لەقسەدا.

### ٣ ئەم ئایەتە لەبەر بکە:

﴿ وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ ﴿١٩﴾ ﴾

## وانەی شانزەهەم

### پاراستنی زمان ( حفظ اللسان )



حەکیم داوای لەیەکێك لەقوتابیان کرد باسی شتێ بکات کە باشترینو جوانترین شت بێت لەمرۆڤدا.

ووتی: زمان ئەگەر لەکردەوەی چاك بەکاری بهێنێ

موسڵمان زمانی خۆی دەپارێزێ لەشەڕو خراپەو لەچاکە بەکاری دێنێ وە نمونەش ئەمانەیە:

- یادو زیکری خوای پێ دەکات.
- پارێزگاری دەکات هەموو ڕۆژێ لەسەر قورئان خوێندن.
- بە ناوی خۆیان بانگی خەڵکی دەکەنو ناوو ناتۆرەش بۆ کەس دانانێ.
- باسی خەڵکی لەپاش ملە ناکاتو جوێن بە کەس نادات.
- ڕێز لەخەڵکان دەگرێ گەمەو گاڵتە بە کەس ناکات.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ ﴿١١﴾ ﴾ الحجرات.

ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە با هیچ کۆمەڵە پیاوێك گاڵتە نەکات بە کۆمەڵێکی تریان ڕەنگە گاڵتە پێ کراوەکان لەگاڵتەکەرەکان باشتر بن لەلای خوادا.

**من مناڵی موسڵمانم زمانم لەچاکە بەکاردێنمو دووری دەکەم لەخراپە**

## هەڵسەنگاندن

١ ئایا دەزانی:

- لایَسْخَر: گەمەو گاڵتە مەکە
- قَوْمٌ: کۆمەڵە پیاوێ

٢ نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر رستەی راستو نیشانەی ( ✗ ) بەرامبەر رستەی چەوت دابنێ لەمانەی خوارەوە:

- منداڵی موسڵمان پارێزگاری لەخوێندنی قورئان دەکات .
- موسڵمان باسی عەیبو نەنگی موسڵمان دەکات.
- موسڵمان زمانی خۆی لەخراپە دەپارێزێ.
- نابێت موسڵمان گاڵتە بەخەڵکانی تر بکات بە زمانی.

٣ ئەم هۆنراوەیە بخوێنەوەو کردەوەی پێ بکە:

بەزمانت باسی عەیبی خەڵکان مەکە    هەموو عەیبو نەنگی یەو خەڵکیش زمانیان هەیە.

٤ ئەم ئایەتە لەبەر بکە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ ﴾ الحجرات:١١.

# وانەی حەڤدەهەم

## ئادابی سەردان کردن ( اداب الزيارة )



ئیسلام هانی خەڵکی داوە بەسەردانی کردنی خزمە نزیکەکانو هاوڕێیان و دراوسێ یان کە دەبێتە هۆی پتەوبونی پەیوەندی نێوانیان وەموسڵمان لەکاتی سەردانی کردن دەبێ ئەم ئادابانە پەیڕەو بکات:

- کاتی گونجاو دانێ بۆ سەردانی کردن ، نابێت لەکاتی نەگونجاو یان بە درەنگانی شەو بچێتە لای خەڵکان.
- لەشوێنی گونجاو دانیشێ لەژووری پێشوازی.
- پارێزگاری لەشوێنی دانیشتن بکاتو خاوێنی رابگرێ.
- نێوانی هەیە لەسەردان واتە زوو زوو نەچێ نەبادا زەحمەت بێ بۆ خاوەن ماڵ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (زُرْ غِباً تَزدَدْ حُباً) رواة الطبراني.

واتە: سەردانی نادیارانە بکەن ناوە بە ناوە خۆشەویستیتان زیاد دەکات

**من منداڵێکی موسوڵمانم سەردانی هاوڕێیانم دەکەم و پەیوەست دەبم بە ئادابەکانی زیارەت**

## هەڵسەنگاندن

**١ ئایا دەزانی:**

- غب: ناوە بە ناوە

**٢ نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر کاتی سەردان کردن لێ بدە:**

- پێش نوێژی بەیانی.
- پاش نوێژی عەسر.
- لەنێوان نوێژی مەغریبو خەوتنان.
- کاتی ئیشو کار.

**٣ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە:**

- ئەو شوێنە چی پێ دەڵێن کە پێشوازی لەمێوان دەکرێت؟

............................................

- کامیان باشترە کە پێش سەردان کردن داوای مۆڵەت بکەی یان نا؟

............................................

- ئایا پێت خۆشە هاوڕێکانت زۆر سەردانت بکەن لەماڵەوە؟ بۆچی؟

............................................

**٤ ئەم فەرمودەیە لەبەر بکە:**

(زُرْ غِباً تَزدد حُباً).

## وانەی هەژدەهەم

### ئادابی سەردانی نەخۆش (زيارة المريض)



قوتابیەك لەقوتابیان نەخۆش کەوت:

وە مامۆستا داوای لەسێ قوتابیان کرد کە لەجیاتی هەموان بچن سەردانی بکەن وە داوای لێکردن لەکاتی سەردانی دا پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکەن کەلەوانەی پەروەردەی ئیسلامی فێری بوون.

- دوعاو پاڕانەوە بۆ نەخۆش کە سەردانی کەر دەڵێ (اللهم رَبَّ النَّاسِ أَذْهَبَ البأْسِ لا شِفَاء إلا شِفاؤُكَ). واتە: پەروەدگاری خەڵکان ئەم نەخۆشیەی لەسەر لابیە و شیفاو چاك بونەوە تەنها شیفا لای تۆیە.
- پرسیارکردن لەحاڵی نەخۆش وسوك کردنی نەخۆشیەکە لێی.
- بیرخەرەوەی نەخۆش بە سەبرو ئارام گرتنو زۆر یادی خوا بکات
- کورت کردنەوەی دانیشتن لای.
- دلوا لەنەخۆش کردن کە دوعا بۆ ئێوە بکات چونکە دوعاو نزای نەخۆش نزیکە لەوەرگیران.

قوتابیان سوپاسی مامۆستایان کرد لەسەر ئەو ئامۆژگارییە بەسودەو بەڵێنیان پێ دا کە پارێزگاری لەو ئادابانە بکەن لەکاتی سەردانی نەخۆش دا.

**من منالی موسڵمانم سەردانی نەخۆش دەکەم و پەیڕەوی لەئادابی سەردان دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

**١ ئایا دەزانی:**

- البأس: نەخۆش

**٢ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:**

- بە چ نزا بۆ نەخۆش دەکەی لەکاتی سەردانی کردنی؟

.............................................................

- چۆن بتوانی باری سەرشانی نەخۆش سوك بکەی و ئازاری کەم بکەیتەوە؟

.............................................................

- ئایا سەردانی نەخۆشێکت کردووە؟چیت کردووە؟

**٣ نیشانەی (✓) بەرامبەر وەڵامی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر وەڵامی ناراست دابنێ.**

- سەردانی کەر لەسەر جێو بانیگانی نەخۆش دادەنیشێ.
- داوا لەنەخۆش دەکەی کە دوعات بۆ بکات.
- سوننەتە دوعا بۆ نەخۆش بکەی بە چاك بوونەوەی.

**٤ ئەم دوعایە لەبەر بکە:**

(اللهم رَبُّ النَّاس أذْهَبَ البأس لا شِفَاء إلا شفاؤُكَ)

**٥ باسی رووداوێك بکە کە سەردانی نەخۆشێکت کردووە.**

## وانەی نۆزدەهەم

### پارێزگاری لەشتو مەکی گشتی (بەشی یەکەم)



خەڵکان سود لەشەقامەکانو گۆڕەپانو باخچەی گشتی دەبینن وەلەزۆر شتو مەکی کە خەڵك سودی لێ دەبینن. وەئیسلام هانی خەڵکی داوە کە پارێزگاری لەشتو مەکی گشتی بکەن .

- منالی موسڵمان لەسەر شۆستە دەڕوات تا شەقامەکان بۆ ئۆتۆمبێل چۆڵ بێت.
- منالی موسڵمان گەمەو یاری بە دارو بەردی شۆستەکان ناکاتو نایان شکێنێ.
- منالی موسڵمان لەگەڵماڵەوەی دەچێتە باخچەکانی گشتیو گوڵ تێك نادات و بەرەنگاری دارو گوڵ نابێتەوە.
- منالی موسڵمان گاڵتە بە بەکارهێنانی تەلەفۆنی گشتی سەر شەقام ناکاتو تێکی نادات.
- منالی موسڵمان پارێزگاری لەخاوێنی شەقامو پاركو گۆڕەپانو باخچەکان دەکات.

پێغەمبەری خوا (ﷺ)دەفەرموێ: (إياكمُ والجلُوسُ في الطرُقات ، فإن أبيتُمْ إلا المجالسِ فأعطوا الطريق حقَها: غَضُ البَصَرِ، وكَفُ الأذى ورد السُلام والأمر بالمَعْروف والنّهيُ عنِ المُنْكرِ) رواه البخاري ومسلم. واتە: خۆتان دووربگرن لەدانیشتن لەسەر ڕێگاوبانەکان ئەگەر هەر نەتوانن وازبێنن، دەبێ مافی ڕێگاوبان بدەن کە ئەوانیش چاونوقاندن لەئاستی حەرام وقەدەغە کراوەکان وەئازارو ئەزیەت نەدانی خەڵکی وە وەڵام دانەوەی سەلامو فەرمان بە چاکەکردنو نەهی کردن لەخراپە.

**من منالی موسڵمانم پارێزگاری لەشتو مەکی گشتی دەکەمو بۆ ئەوەی هەموو خەڵکی سودی لێ وەرگرن**

## هەڵسەنگاندن

**١** ئایا دەزانی:

- أبيتم: قەدەغەتان کرد
- غض البصر:چاو دوورگرتن لەشتی حەرام کراو
- كف الأذى: هەلگرتنو لابردنی شتی پیس

**٢** نیشانەی (✓) لەژێر هەڵسو کەوتی راستو نیشانەی (✗) لەژێر هەڵسو کەوتی ناراست دابنێ لەم وێنانەی خوارەوە:









**٣** ئەم فەرمودەیە رەنگ بکەو لەپاشان لەبەری بکە:

إياكم والجلوس على الطرقات فإن أبيتم الا المجالس فأعطوا الطريق حقها: غض البصر وكف الذي ورد السلام والامر بالمعروف والنهي عن المنكر

## وانەی بیستەم

### پارێزگاری لەشت و مەکی گشتی بەشی دووەم



ئیسلام فەرمانی پێکردووین بە پارێزگاری کردن لەشت و مەکی گشتی .

لەوانەش قوتابخانە کە شوێنی بڵاوبونەوەی عیلمو زانیاریەو هەروەها مزگەوتیش کە نوێژو خواپەرستی تێدا دەکرێت.

- منداڵی موسڵمان پارێزگاری لەبناغەی قوتابخانە دەکات بە خاوێنی رادەگرێ وە دیواری قوتابخانە پیس ناکات وەلەسەری نانوسێ و زبڵو خاشاک لەسەر زەوی فڕێ نادات.
- منداڵی موسڵمان پارێزگاری لەپاسو ئۆتۆمبێلی گواستنەوە دەکات وگاڵتە بە کورسیو شوشەی پەنجەرەکە ناکات.
- منداڵی موسڵمان کە دەچێتە مزگەوت پێڵاوەکانی لەشوێنی تایبەت دادەنێ.
- منداڵی موسڵمان پارێزگاری لەسەر خاوێنی مزگەوت دەکات و هاوبەشی دەکات لەخاوێن کردنەوەی گۆڕەپان و ئاودەستی مزگەوت هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی :(إن هذه المساجد لا تَصْلحَ لشيءٍ مِنْ هذا البَوْلِ والقذر إنما هيَ لِذكرِ الله تعالى وقراءة القرآنِ ) رواه مسلم. واتە: مزگەوت دانەنراوە بۆ میزو پیسایی کردن بەڵکو بۆ یادی خوداو نوێژو قورئان خوێندن بنیات نراوە.

**من منداڵی موسڵمانم پارێزگاری لەخاوێنی مزگەوت و قوتابخانە دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

**١ ئایا دەزانی:**

- القذر: پیسایی

**٢ نیشانەی (✓) بەرامبەر وەڵامی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر وەڵامی چەوت دابنێ.**

- قوتابی ناوی خۆی لەسەر کورسی دانیشتن دەنوسێ.
- قوتابیەکان پیسایی‌و زبڵ دەخەنە ناو سەبەتەی زبڵ دان.
- کچەکان یارمەتی دایکیان دەدەن لەپاککردنەوەی حەوشەی ماڵەوە.
- نوێژ خوێن پێڵاوەکانی دەخاتە ناو شوێنی تایبەتی بە پێڵاوەکان.

**٣ ناوی سێ لەشتو مەکی گشتی بنوسە:**

- ستونی تەلەفۆنو کارەبا.
- ..........................
- ..........................
- ..........................

**٤ فەرمودەی پیرۆزی پێغەمبەر لەبەر بکە:**

(إنّ هذهِ المُسَاجِدُ لاَ تُصْلِحُ لشَيء منْ هَذاَ البَول والقذرِ إنّما هِيَ لذِكْرِ الله تَعَالى وقَراءة القرآن)

## وانەی بیست و یەك

### پشت بە خۆ بەستن (الاعتماد على النفس)



ئایینی ئیسلام ئەو کەسەی خۆش دەوێ کە پشت بە خۆی دەبەستێ‌و وە هەروەها ئافرەتی موسڵمانیش کە پشت بە خۆی دەبەستێ ئەوە دەبێتە خێرو خۆشی بۆ خانەوادەکەی .

بۆ نمونە: جوتیار پشت بە خۆی دەبەستێ، زەوی دەکێڵێ‌و تۆی پیادەکات.

وە کرێکاریش پشت بە خۆی دەبەستێ بە ماندوبونی خۆی ئیش دەکات ورزق‌و رۆزی بۆ منالەکانی پەیدا دەکات. وەئافرەتیش لەماڵەوە پشت بە خۆی دەبەستێ فەرمانی خۆی بە تەواوی و کاری ماڵەوەی بە جوانترین شێوە دەکات. وەفەرمانبەریش پشت بە خۆی دەبەستێ فەرمانی خۆی بە تەواوی‌و رێك‌و پێکی ئەنجام دەدات. وە قوتابییش پشت بە خۆی دەبەستێ وە فەرمانی قوتابخانەی جێ بەجێ دەکات.

ئەوەبوو عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێ بێت) جارێك بە لای کۆمەڵێ لەخەڵکان رەت بوو ، بێ ئیش‌و کار وەستا بوون، فەرمووی ئێوە کێن ووتیان پشتمان بە خوا بەستوە ، فەرموی: درۆ دەکەن بەڵکو پشت بەستن بە خوا ئەوەیە پیاوێ زەوی داچێنێ دەنکە گەنمی پیابکات‌و لەپاشان پشت بەخوا ببەستێ وەبڵێ خوایە رزق‌و رۆزیم پێ بدە.

**من منالی موسڵمانم هەوڵ‌وتەقەلا لەخۆمەوە لەهەموو کاروبارێکدا وە دوایی پشت بە خوا دەبەستم**

## هەڵسەنگاندن

**١ ئایا دەزانی:**

- المتوکل: ئەوەی ئیش دەکات داوای سەرکەوتن لەخوا دەکات.
- المتواکل: ئەوەی چاوی لەخوایە کە رزق‌و رۆژی پێ بدا بێ کارکردن.

**٢ نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر وەڵامی راست‌و نیشانەی ( ✗ ) بەرامبەر هەڵسوکەوتی ناراست دابنێ.**

- بازرگانێ دەرگای دوکانی دەکاتەوە بەیانیان وشت بە خەڵك دەفرۆشێ.
- قوتابی بەیانیان لەخەو هەڵدەستێ خۆی ئامادە دەکات بۆ قوتابخانە.
- پیاوێ داوای رزق‌و رۆزی لەمناڵەکانی دەکات‌و خۆی ئیش ناکات.
- مامۆستا کاری فەرمانبەری جێ بە جێ دەکات وەماڵەکەی بە چاکی بەڕێوە دەبات.

**٣ باسی رووداوێك بکە کە خۆت پشتت بە خۆ بەستیوو.**

- ..........................................................
..........................................................

**٤ باسی هەڵوێستی عومەری کوڕی خەتتاب بکە لەگەڵ ئەوانەی لەسەر زگی خەڵك دەژین.**

- ..........................................................
..........................................................

## وانەی بیست و دوو

### چاوتێری (القناعة)



چاوتێری خوورەوشتێکی بەرزی ئیسلامەودەبێ موسڵمان لەهەموو کارو بارێکدا پەیڕەوی بکات.

- موسڵمان پەیوەستە بە چاوتێری هەوڵی داواکردنی خێرو چاکە دەکات لەپاشان رازی بێ بەو بەشەی خوا پێی داوە.
- موسڵمان پەیوەستە بە چاوتێریو سوپاسگوزاری خوای گەورە لەسەر ئەو لەش ساغی یەی کە خوا پێی داوە.
- موسڵمان پەیوەستە بە چاوتێریو سوپاسو شوکری خوا دەکات لەسەر پێدانی منداڵ.
- موسڵمان چاوی تێرەو قەناعەتی هەیەو چاونابڕێتە نێو ماڵو سامانی خەڵکی .
- موسڵمان چاوی تێرەو حەسودی بە دەوڵەمەندو، بەهێزو،ئەوەی منداڵی زۆرە نابات.
- موسڵمان چاوی تێرەو داواو سواڵ لەخەڵکی ناکات بەڵکو کاردەکات ماندوبونی سەرف دەکات بۆ داواکردنی رزقو رۆزی لەخوا.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ((لَيْسَ الغِنَى عَنْ كَثْرَةِ العَرْضِ ولَكِنْ الغِنَى غنى النَّفْس) رواه البخاري ومسلم. واتە: دەوڵەمەندی بە دەوڵەمەندی ماڵو سامان زۆری نی یە بەڵکو دەوڵەمەندی دڵو دەروونە.

**من منداڵی موسڵمانم سواڵو داوا لەکەس ناکەم وە پەیوەست دەبم بە چاوتێری**

## هەڵسەنگاندن

١ ئایا دەزانی:

- العَرْضْ: ماڵو سامان

٢ لەم هەڵوێستانە چی دەکەی؟

- باوکت ماڵو سامانی زۆری پێ داوی بۆ ماڵو خانەوادەکەت وە دراوسێ یەکت هەژارە لەتەکت وەستاوە.

.............................................

- ماڵی دراوسێ یەکەت گەورەو جوانە ، چەندەها نهۆمە.

.............................................

- باوکت ماندوو بووە کاری کردووە بەڵام رزقو رۆزی سنوردارە.

.............................................

٣ کامیان بەڕێزترە؟ وەلەبەرچی؟

- دەوڵەمەندەو ماڵو سامانی زۆرە بەڵام زیاتر ماندوە بۆ ماڵ زیادبوون.
- یان پیاوێ مام ناوەندیە رازیە بەو بەشەی خوا پێی داوە.

٤ ئەم فەرمودەیە لەبەر بکە:

((لَيْسَ الغِنَى عَنْ كَثْرَةِ العَرضْ وِلَكَنْ الغِنىَ غني النَّفس))

٥ ئەم پەندی داناییە رەنگ بکە:

القناعة كنز لا يفنى



# وانەی بیست و سێ یەم

## دادگەری ( العدل ) بەشی یەکەم



نوعمانی کوڕی بەشیر نەخۆش کەوت ڕۆژێك وە چووە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ئەم کوڕەم ماڵو سامانی خۆم پێ داوە وە ببە بەشاهید لەسەری.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی ئایا جگە لەم منالە هی ترت هەیە؟

نوعمان (خوا لێی رازی بێت) فەرمووی : بەڵێ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموی : ئایا هەمویان وەکو یەك ئەم ماڵت پێ داون؟

نوعمان وتی: نەخێر.

پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی: ئایا پێت خۆشە لەچاکەکردن وەکو یەك بن؟

نوعمان فەرموی : بەڵێ.

پێغەمبەری خوا (ﷺ)من نابمە شاهید چونکە شاهێدی لەسەر ستەم نادەم ( فلا تَشْهَدْني فإنّي لا أشْهَدُ علَى ظلْمٍ).

نوعمان ماڵو سامانی لەکوڕەکەی ستاندەوە و بە دادپەروەری دابەشی کرد. (رواه البخاري ومسلم). بەم جۆرە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێرمان دەکات کە هەوڵی دادپەروەری بدەین لەگشت کارەکانماندا.

**من منالی موسڵمانم حەزدەکەم دادپەروەر بم لەگەڵ دادپەروەراندا بم**

## هەڵسەنگاندن

**١ ئایا دەزانی:**

- وهبت: داوتە
- سواء:بەیەکسانی

**٢ وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەوە:**

- بۆچی نوعمانی کوڕی بەشیر چوە لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)؟

..................................

- ئایا نوعمان هەمو سامانەکەی بەیەکسانی دابە منداڵەکانی؟

..................................

- ئایا وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی بوو لەسەر داواکردنی نوعمان؟

..................................

- بۆچی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئامادەی دابەش کردنی ماڵو سامانی نوعمان نەبوو؟

..................................

- نوعمان پاش ئەوە چی کرد؟

**٣ نیشانەی (✓) بەرامبەر هەڵسو کەوتی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر هەڵسوکەوتی چەوت دابنێ لەمانەی خوارەوە:**

- پیاوێ جیاوازی کرد لەنێوان منداڵەکانی دا لەبەر ئەوەی لەیەك دایك نەبوون.
- دایکێك منداڵانی خۆی لەگەڵ خۆی دەبات بۆ شوێنێ بە تۆبەت.
- منداڵ گوێڕایەڵی باوکی دەبێ جگە لەدایکی ئەویش چی داوا بکات بۆی دەکات.
- باوکێك جلو بەرگ بۆ منداڵە بچوکەکانی دەکرێت لەجەژندا.

**٤ ئەم وشانەی فەرمودەی پیرۆز رێك بخەو دوایی لەبەری بکە:**

| لا | ظلم | فإني | على | أشهدُ |
|---|---|---|---|---|

## وانەی بیست وچوارەم

### دادگەری ( العدل ) بەشی دووەم



ئایینی ئیسلام فەرمانی کردووە بەچەسپاندنی دادپەروەری لەنێوان خەڵکی دا وەلەوانەش:

- ئەگەر دوو کەس دووبەرەکی لەنێوانیان رووی دا چوونە لای قازی دەبێت ئەویش بە دادپەروەری لەنێوانیان دا بێت وگوێ لەهەردوکیان راگریێو بەیەکسانی لەلایان دادەنیشیێو حوکم بە حەقو راستی بکات.
- دادپەروەری لەنێوان خەڵکی دا بکاتو نابێت پاڵپشتی برادەرێك یان نزیکی خۆی بێتو بەڵکو یارمەتی ستەم لێکراو بداتو مافی بۆ بسەنیێ.
- ئەگەر دادپەروەری پەیرەو کرا ئەوا ئەمنو ئاسایش بەر قەرار دەبیێ هەموو کەس لەخۆیو سەروماڵی ئەمین دەبێت و خەڵکان سەرکردەی خۆیانیان خۆش دەویێ و دەبنە هاندەری و یارمەتی دەری لەهەمو کاروبارێکدا.
- دادپەروەری بناغەی ماڵو سامانو دەسەڵاتە.

خوای گەورە دەفەرمویێ: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ۚ ﴿٥٨﴾﴾ النساء.

کاتیێ دادوەریتان کرد لەنێوان خەڵکاندا ، خودا فەرمان دەکات بە دادپەروەری حوکم بکەن.

**من منداڵی موسڵمانم حەزدەکەم سەرکارمان داد پەروەر بێت**

## هەڵسەنگاندن

١ ئایا دەزانی:

- یحابی: جیاوازی کرد

٢ لەم دوو هەڵوێستەدا چۆن دادپەروەری دەگات بە ئامانج:

- کاتێ دیاریەکت بۆ خوشکێکی بچوکت کڕی؟
- ویستت کتێبێك بەئەمانەت وەرگری لەکتێبخانە وە لەم کاتەدا بینیت سێ قوتابی دەیانەوێ کتێب بە ئەمانەت بێنن لەقوتابخانە.

٣ نیشانەی (✓) بەرامبەر هەڵس و کەوتی راست و نیشانەی (✗) بەرامبەر هەڵسوکەوتی چەوت دابنێ لەمانەی خوارەوە:

- دادوەری دادپەروەر خۆی بەگەورەتر نازانێ لەسەر خەڵکانی تر.
- بەڕێوەبەری قوتابخانە بە چاوێك تەماشای هەموو قوتابیان دەکات.
- قازی لەدانیشتنگای خۆی دا پیاو ماقوڵ و فەرمانبەران دادەنێ لەجگە لەخەڵکی تر.
- دادپەروەر دەبێ ماف لەستەمکار بسەنێ بۆ ستەم لێکراو.

٤ ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز لەبەر بکە:

﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ۚ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ ۗ ﴿٥٨﴾﴾ النساء.

٥ ئەم رستەی پەندی پێشینان لەبەر بکە:

دادپەروەری بناغەی ماڵ و سامانە

# وانەی بیست و پێنجەم

## شەرمو شکۆیی (الحَیاءُ)



شەرمو حەیا خورەوشتێکی گەورەیە کە خوای گەورە خۆشی دەوێ وە پێغەمبەری خواش (ﷺ) حەزی لێ دەکات وە شەرمی خورەوشتێکە بانگ دەکات بۆ وازهێنان لەخراپەو خراپەکاری قسەو کردار.

وە موسڵمان لەخوا شەرم دەکات لەبەر ئەوە چونکە:

- پارێزگاری لەنوێژەکانی دەکات وشەرم دەکات وازی لێ بهێنێ.
- قسەی باش دەکاتو شەرم لەخوا دەکات کە وشەی خراپ بە زمانی دابێت.
- شتی حەڵاڵ دەخواتو شەرم دەکات دەست بۆ حەرام درێژ بکات .
- هەوڵ دەدات بۆ رەزامەندی خوا وەشەرم دەکات خوا ببینێ لەسەر کردەوەی ناڕەوا.
- موسڵمان شەرم لەخەڵکی دەکات وە پارێزگاری لەسومعەی خۆی دەکات وەشەرم دەکات خەڵکان بە خراپە باسی بکەن.

وەئافرەتی موسڵمان شەرم لەخوا دەکات وە پاشان لەخەڵکیش بۆیە شەرمگای خۆی دەپارێزێو، شەرمو حەیا هەمووی خێرە، وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر بەشەرمو حەیا بوو.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ ((استَحیُوا مِنَ اللہ تعالی حَقَّ الحیاء) رواه الترمذي .

واتە: شەرم لەخوا بکەن بە جوانترینو چاکترین شەرم.

**من منالی موسڵمانم خوورەوشتی بەحەیابوونم هەیە**

## هەڵسەنگاندن

**١ ئەم وشانەی گونجاون بخەرە شوێنی خۆی لەم رستەی خوارەوە:**

شەرم | باشە | پێغەمبەر

شەرم هەموو............چونکە............ی خوا (ﷺ) زۆر بە............بوو.

**٢ نیشانەی (✓) بەرامبەر رستەی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر رستەی چەوت دابنێ لەمانەی خوارەوە:**

- موسڵمان لەخوا شەرم دەکاتو لەخەڵکیش شەرم دەکات.
- منداڵی موسڵمان هەوڵ دەدات بەو شێوەیە بێت کە خوا خۆشی دەوێ.
- کردەوەی خراپ شەرمو حەیا لەکەدار ناکات.
- شەرمو حەیا خورەوشتی بەرێزە پیاو چاکان هەوڵی بۆ دەدەن.

**٣ چی دەکەی ئەگەر:**

- برایەکت دیت شەرم لەدراوسێ ناکاتو جنێویان پێ دەدات؟

..........................................................

- خوشکی خۆت بینی شەرمی لەخوانەکردو چووە دەرەوە بەسەر رووتی ؟

..........................................................

- گوێت لەبانگی عەسر بوو پێش کۆتایی هاتنی وانەکەت.

..........................................................

**٤ ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) رەنگ بکەو دوایی لەبەری بکە:**

استحيوا من الله تعالى حق الحياء

## وانەی بیست و شەشەم

### چاككردنی نێوان دوو كەس



حەمزە گەیشتە بەر دەرگای قوتابخانە پێش ئەوەی زەنگی وانە لێبدرێت وە خۆی حەزی نەكرد دوابكەوێ لەقوتابخانەدا وە چاوی بە هاوڕێیەكەی بكەوێ كە ناوی موحەممەد بوو كە وەستابوو لەگۆڕەپانی قوتابخانە سڵاوی كرد ووتی (السلام علیكم ورحمە الله وبركاتـە) حالت چۆنە، ئەی موحەممەد؟ موحەممەدیش وەڵامی سڵاوی دایەوەو حەمزە پرسیاری لەموحەمەد كرد : بۆچی بە تەنیا دەت بینم ؟ ئەی ئەنەس كوا؟ وە موحەممەدیش ئاماژەی بە شوێنێكی گۆڕەپانی كرد كە ئەنەس لەوێ وەستابوو. وە حەمزە زانی كەوا نێوانی موحەممەدو ئەنەس تێك چوو بوو. وە نەیان دەویست لەگەڵ یەكدا تەوقە بكەن وە حەمزە توانی ئەنەس‌و موحەممەد بگەینتە یەك‌و وە پێ یانی فەرموو نابێت موسڵمان لەگەڵ برای موسڵمانی خۆی قسە ببڕی وە هەر دەبێ ئاشتی‌و صولح بەرقەرار بێ وە هەروەكو پێغەمبەری خوا(ﷺ) صولح‌و ئاشتی لەنێوان موسڵمانان بەرپاكرد وەلەبەر ئەوە دەبێ خەڵكان چاو بپۆشن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی (لا یَحل لمسلمٍ أنّ یَهْجرُ أخاه فَوْقَ ثلاث لیال ، یلتقیان فیعرض هذا ویعرض هذا وخیرهما الذي یبدأ بالسلّام) متفق علیە. واتە: نابێت بۆ موسڵمان دەنگ ببڕێ لەگەڵ برای موسڵمانی خۆی لەسێ شەو زیاتر ئەویان ڕوی لەوی تر وەردەگێڕێ وە ئەوی تریان بە هەمان شێوە وەچاكترین كەسیان ئەوەیە كە كامیان بەسەلام دەست بە گفت‌و گۆ دەكاتەوە.

وە موحەممەدو ئەنەس پەیمانیان دا بەیەكداو كەلەمەودوا پەیوەندی خۆیان پەرە پێ بدەن وە تەوقەیان لەگەڵ یەكتر كردو حەمزە ووتی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ﴿١٠﴾﴾الحجرات. بڕواداران برای یەكن‌و ئاشتی‌و صولح لەنێوانتان بكەن.

**من منداڵی موسڵمانم هەڵدەستم بە چاككردنی نێوانی دوو كەس**

## هەڵسەنگاندن

### ١ وەڵامی ئەم پرسیارانە بکەن:

- بۆچی موحەممەد بەتەنیا وەستابوو؟

..........................................................

- حەمزە چی کرد لەوکاتەی ئەو دوو برادەرەری دیت کە نێوانیان تێك چوو بوو؟

..........................................................

- ئایا دەبێ موسڵمان لەگەڵ براکەی دەنگ ببڕێ؟

..........................................................

### ٢ ووشەی گونجاو بخەرە ناو بۆشایی گونجاو:

إخوة | چاککرد | برای

- پێغەمبەری خوا ..............نێوانی خەڵکی کرد.
- خوای گەورە دەفەرموێ : (إنما المؤمنون..............
- نابێ موسڵمان دەمە قاڵێ ی لەگەڵ ..............موسڵمان بکات.

### ٣ باسی هەڵوێستەك بکە کە لەنێوانی دوو کەسە کە کردۆتە.

### ٤ ئەم فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر بکە:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:(لا يَحِلُ لِمُسلْم أنْ يُهجرُ أخُاهُ فُوْقُ ثَلاَثِ ليالِ، يلْتقيانِ فَيُعرضُ هذا ويعرض هذا وخيرهما الذي يبدأ بالسلام) متفق عليه.

# وانەی بیست و حەوتەم

## گوفتاری باش ( طیب الکلام )



خوای گەورە فەرمانی بە بەندە موسڵمانەکانی کردووە کە گفتو گۆ دەکەن بە گفتو گۆی جوان، کە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ﴿٥٣﴾ ﴾ الإسراء. ئەی موحەممەد بڵێ بە بەندەکانم قسەیەك بکەن کە جوانترو باشترینی قسە بێت، بەراستی شەیتان هەمیشە ناکۆکی و ئاژاوە دەخاتە نێوانیان،وەلەبەر ئەمە موسڵمان دەبێ:

- لەگفتوگۆدا قسەی جوان بێت وە خوا بەرەکەتی تێ دەخاو پاداشتی بە چاکە دەداتەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ ﴿١٠﴾ ﴾ فاطر. ووتەی چاكو پاك تەنها بۆ لای خوا سەردەکەوێ.
- دووردەکەوێتەوە لەقسەی نابەجێ چونکە لەلای شەیتانەوەیە بەقسەی چاك و پاك خێر چاکە دەکات پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ (والكَلِمَة الطيبة صَدَقَة) متفق عليه. واتە: ووتەی چاك بە خێرو صەدەقە دەنوسرێ.
- دەبێتە هۆی راکێشانی دڵی خەڵکان بۆیو خۆشەویستی خەڵکان بۆی بە ووتەی جوان چونکە خەڵکان دوور دەکەونەوە لەخاوەن قسەی نابەجێ و توندو تاڵ. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران. ئەگەر تۆ بەدخوو قسە رەقو دڵ رەق بویتایە ئەوە هەموو بڵاوەیان کرد لەدەورت.

**من منداڵی موسڵمانم قسەی چاكو پاك دەکەم**

## هەڵسەنگاندن

### ١ ئایا دەزانی :

- الكلم الطيب: قسەی جوانو ڕێكو پێك
- الفظ: قسەی ڕەقو نابەجێ

### ٢ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

- بەچی خوای گەورە فەرمانی کردووە بە موسڵمانان لەلایەنی ووتەدا؟

..............................................................

- ئایا ووتەی چاك خێرو پاداشتی هەیە؟

..............................................................

- چۆن دڵی خەڵكان بۆ خۆمان ڕاكێشین؟

..............................................................

### ٣ ئەمانە تەواو بكە:

لەو کاتەی موسڵمان دەڵێ ووتەی جوان چونکە :

- پاداشتو ئەجر لەلایەن خوا وەردەگرێ.
- ..............................................................

### ٤ ئەم فەرمودەیە لەبەر بكە:

(والكَلَمةُ الطّيبَةُ الصَدَقةٌ)

## وانەی بیست و هەشتەم

### ڕووخۆشی (بشاشه الوجه)



موسڵمان هەموو کەسێکی خۆش دەوێت، وە بەردەوام هەوڵ دەدات بۆ کاری چاکەو یاریدەدەری خەڵکانی تر، وەلەجۆرەکانی چاکە: ڕووخۆشی، موسڵمان ڕووی خۆشە بەردەوام لەگەڵ برایەکانی موسڵمانی خۆی ڕووی گەشاوەیە، وە ڕووی گرژ نییە وە پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەفەرموێ: (لا تحْقرنّ مِنَ المَعْروُفِ شَيئا، ولوُ أنْ تلْقَى أخَاكَ بوَجْهٍ طَلِيقٍ) رواه مسلم. واتە: لەخێرو چاکە بە کەم مەزانە، با بگەی بە برای خۆت بە ڕوویەکی خۆش،وە موسڵمان لەو کاتەی ڕووی خۆشە بەرامبەر برای موسڵمانی خۆی ئەوا:

- پاداشتو چاکەی دەست دەکەوێ لەلای خوای گەورە هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی (وتَبَسُمُكَ فِي وَجْهِ اخيكِ صَدَقَةٌ) واتە: ڕووخۆشی بەرامبەر برای موسڵمانت خێرو صەدەقەیە.
- هەروەها دەبێتە هۆی خۆشەویستی خەڵکان بۆی وە ڕێزی دەگرن.
- بەردەوام ڕووخۆشو کامەرانو کەیف خۆشە.

**من منالی موسڵمانم ڕوو خۆشە بەرامبەر برای موسڵمانم**

## هەڵسەنگاندن

**١ ئایا دەزانی:**

- لا تحقرن: بە بێ قیمەتو بە کەم مەزانە
- طليق: رووخۆشو دەم بە پێکەنین

**٢ موسڵمان چی سود لێ دەبینێت کاتێ رووی خۆشە بەرامبەر براکانی:**

- ............................................
- ............................................
- ............................................

**٣ نیشانەی (✓) بەرامبەر دەستەواژەی راستو نیشانەی (✗) بەرامبەر دەستەواژەی چەوت دابنێ لەمانەی خوارەوە:**

- قوتابی رووی بە پێکەنینە لەکاتێ دەگات بە براکانی.
- قوتابی تورە دەبێت کاتێ دایکی داوای شتێکی لێ دەکات.
- قوتابی بە هاورێکانی دەڵێت (السلام عليكم ورحمه الله وبركاته) وە رووی گرژە.

**٤ ئەم فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) رەنگ بکە:**

لا تحقرن من المعروف شيئا
ولو أن تلقى أخاك بوجه طليق

## وانەی بیست و نۆهەم

### سوپاس گوزاری نیعمەتەکان ( بەشی یەکەم )



مامۆستا هاتە پۆلی سێ یەمی بنەڕەتی وە ووتی: وانەی ئەمڕۆمان ئەی خۆشەویستان دەربارەی شوکرو سوپاس گوزاری نیعمەتی خوایە، مامۆستا پێی وتن : لەئێستا باسی نیعمەتەکانی کە خوا پێی بە خشیوین دەکەم. قوتابیان ووتیان: ئەو نیعمەتانە چین ئەی مامۆستا؟ مامۆستا ووتی : یەکەم نیعمەتێ نیعمەتی ژیانە خوای گەورە دروستی کردوین و ژیانی پێ داوین ، هەروەکو دەفەرموێ: ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾﴾ يس. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: ئەو زاتە زیندویان دەکاتەوە کەلەیەکەم جارەوە بەدی هێناون وە ئەو بە هەموو دروست کراوێك زاناو ئاگادارە . وە دووەم نیعمەت : نیعمەتی عەقلو ژیریە کە بەهۆیەوە بیری لێ دەکەینەوە وە جیا لەگیانەوەرانی تر. وەسێ یەمیش: نیعمەتی لەش ساغی یە کە خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾﴾ التين. سوێندبە خوا بەراستی مرۆڤمان دروست کردوە لەجوانترین شێوە. وەچوارەمیان: نیعمەتی ئیسلامەتی یە کە خوای گەورە پێی رازیە هەروەك دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا ﴿٣﴾﴾ المائدة. ئەمرۆ ئاینەکەتانم تەواو کردووەو کامل کردووە بۆتان وە چاکەو بەهرەی خۆم بە تەواوی رشتوە بەسەرتاندا ورازی بوم کە ئیسلام ئاینتان بێت . ئەوانە بەشێك بوون لەنیعمەتەکانی خوای پەروەدگار . ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە سوپاس گوزاری خوا بین!!

قوتابیان: بەڵێ ئەی مامۆستا ، خوایە بمان گەینە بەسوپاس گوزاران.

**من منالی موسلمانم سوپاسی خوا دەکەم لەسەر نیعمەتەکانی**

## هەڵسەنگاندن

**١ نیشانەی ( ✓ ) لەسەر رستەی راستو نیشانەی ( ✗ ) بەرامبەر چەوت دابنێ.**

لەنیعمەتەکانی خوا لەسەر ئێمە:

- ژیری (العقل)
- شێتی (الجنون)
- زیرەکی

**٢ وەڵامی راست لەشوێنی گونجاو دابنێ**

لەنیعمەتەکانی خوای گەورەیە کە گیانەوەرانی مل کەچ کردووە بۆ ئێمە کە سودی هەبێت:

- گۆشت
- ..........................
- ..........................

**٣ هەندێك لەنیعمەتەکانی خوای گەورە لەسەر مرۆڤەکان بنوسە:**

- نیعمەتی ..............................................
- نیعمەتی ..............................................
- نیعمەتی ..............................................
- نیعمەتی ..............................................

**٤ ئەم رستەیە رەنگ بکە:**

اللّه خلقنا ووهب لنا نعماً كثيرة

## وانەی سێیەم

### سوپاس گوزاری نیعمەتەکان ( بەشی دووەم )



مامۆستا بە قوتابیەکانی وت: ئەگەر یەکێك دیاریەکی پێش کەش کردوین چی پێ بڵێین ؟
قوتابیەکانیش وتیان سوپاس.
مامۆستا ووتی : بۆ ئەم نیعمەتانە دەبێ سوپاس گوزاری خوا بکەین.
قوتابیەك ووتی: چۆن شوکرو سوپاسی خوا لەسەر نیعمەتەکانی بکەین ئەی مامۆستا؟
مامۆستا ووتی:
یەکەم: بە پارێزگاری کردن لەسەری، خوای گەورە دروستمانی کردووە با پارێزگاری نیعمەتی بکەین بازیانی خۆمان نەخەینە مەترسی یەوە و خوا پەرستی تیادا بکەین.
دووەم: بە بەکارهێنانی تەواوو راست چونکە خوای گەورە عەقلو ژیری پێ بەخشیوین دەبێ لەشتی پەسەندو حەلال بەکاربهێنین.
سێ یەم:نابێت نەفسی خۆمان بخەینە مەترسی یەوە کە زەرەرو ناخۆشی پێ بگات کەوا ساغی و سەلامەتی نەفس ئەوەیە کە لاشەمان دور خەینەوە لەوەی ئازارو زەرەری پێ بگات وە بەبەکارهێنانی دەرمان بۆ دورکەوتنەوەی لەنەخۆش وەبەبەکارهێنانی خواردنی گونجاو بۆی.
چوارەم: سود وەرگرتن لەوشتانەی کە خوا بۆیانی دروست کردووە لەو بەروبومی زەوی لەگژوگیاو گیانەوەران وەلەئاویش.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۝٧﴾ إبراهیم. واتە: ئەگەر ئێوە زیاتر شوکرو سوپاس گوزاری خوا بکەن خوای گەورە بەخششەکانی خۆی لەسەرتان زیاد دەکات.

**من منالی موسڵمانم شوکرو سوپاس گوزاری خوام لەسەر نیعمەتەکانی دا**

## هەڵسەنگاندن

**١** وەڵام بە دانانی نیشانەی (✓) بەرامبەر رستەی راست وەنیشانەی (✗) بەرامبەر رستەی ناراست دابنێ.

سوپاس گوزاری نیعمەتەکانی خوا دەبین بەو رێگایانەی خوارەوە:

- بە دورکەوتنەوە لەمەترسی یەکان.
- بە کوشتن.
- بە پارێزگاری لەسەر نەفس.

**٢** ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بەو وتانەی گونجاوی خوارەوە پڕبکەرەوە:

حەلال — سود — راست

سوپاس گوزاری خوا دەبین لەسەر نیعمەتەکانی بەبەکارهێنانی ................بۆ ئەوە لەبەر ئەوە بیرکردنەوە لەسەر هەمو کارەکانم..............و کردەوەی ................کردن

**٣** هەر رستەیەك لەستونی یەکەم بگەینە بەرستەی گونجاوی ستونی دووەم:

| ستونی یەکەم | ستونی دووەم |
|---|---|
| ئەگەر دیاریەکیمان پێ گەیشت | بەبەکارهێنانی دەرمان لەکاتی نە خۆشی دا |
| سوپاسی خوا دەکەین لەسەر نیعمەتەکانی | دەڵێین سوپاس |
| پارێزگاری لەسەر نیعمەتی لەش ساغی | بەپارێزگاری کردن لەسەری |

ئەم رستەی خوارەوە رەنگ بکە:

نشكر الله دائماً على نعمه

## کۆتایی

لەکۆتایی دا لەخوا دەپارێمەوە کە ئەم نوسینەم لێ وەربگرێو لەکردەوە چاکەکانم ئەژماری بکاتو شەرمەزاری باری قیامەت نەبینو لەسەر حەوزی کەوسەر لەبەهەشت لەخزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ببینو ببتە هۆی هیدایەت دانی خەڵکان بۆسەر ئایینی ئیسلام.

وە بۆ راڤەی تەفسیری ئایەتەکان سودم لەتەفسیری قورئانی پیرۆز مەلا موحەممەد مەلا صالح بامۆکی وەرگرتووە.

وەرگێڕ

أنور قادر شێخانی

٣ی ذي القعدة ١٤٣٤ ك

٢٠١٣/٩/٩ میلادی

هەولێر/ گەڕەکی گوڵان

# پێرستەکانی ئەم کتێبە

